# گرفته سەرەکییەکانی کورد

«لێکۆڵینەوە و ڕەخنە»

حوسێن محەمەد عەزیز

2700 ك / 2000 ز

گرفتە سەرەکییەکانی کورد
دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز
چاپی دووەم
کوردستان ـ سولەیمانیی
ژمارەی سپاردن ( ٤٣٥ )
ساڵی 2000
تیراژ 500 دانە
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای دیموکراسیی ـ سولەیمانیی

پێشکەشبێ بە
« لەیلا زانا »ی وولاتپارێز و قارەمان، کە لە پێناوی ئازادیی گەل و نیشتمانەکەیدا، ئازادیی خۆی ڕەتکردەوە.

# نـــــــــاوەڕۆک

## پێشـــــەکیی :

بە هۆی ئەو بارودۆخە نالەبارەی، ئەورۆ لە باشووری کوردستاندا خولقاوە، ڕیزەکانی گەل بە گشتیی، ڕیزی ڕووناکبیران و نووسەرانی کورد بە تایبەتیی، بە جۆرێ پارچەپارچە بوون، دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان، بە هیچ شێوەیە ئیرمییمان پێ نابەن!
دیارە گەر نووسەرێ، لە پێناوی پارە و پلەوپایەدا، پێ لە ویژدانی خۆی بنێ و پێنووسەکەی بفرۆشێ، ئەوا دەبێ، کێشەی سەرەکیی نەتەوەکەی، لە بیر خۆی بەرێتەوە، پشگیریی یەکێ لەو دوولا شەڕکەرە بکا، هێندەی دیکە قوڕی ناکۆکیی و دووبەرەکیەکە خەستترکاتەوە. ئەو کاتە ئەو لایەنە، گەلێ ڕێزی لێ دەگرن و بە هەموو شێوەیە پشگیری لێ دەکەن.
لێرەدا دەتوانین، چەن نموونەیەک بێنینەوە. گەر هەر نووسەرێ، تەنیا ڕەخنە لە یەکێتی نیشتمانیی کوردستان بگرێ، بە هیچ شێوەیە باسی هەڵەکانی پارتی دیمۆکراتی کوردستانی یەکگرتوو نەکا، ئەوا ئەندامانی یەکێتی دژایەتی دەکەن، ئەندامانی پارتیش بە کوردپەروەر، نیشتمانپەروەر و دڵسۆزی دادەنێن، ڕێزی لێ دەگرن، پڕوپاگەندە بۆ بەرهەمەکانی دەکەن، بە نووسەرێکی گەورەی دەناسێن، با خۆشی و نووسینەکانیشی، سەنگی چڵە پوشێکیشیان نەبێ!
هەروەها، گەر نووسەرێکی دیکە، تەنیا ڕەخنە لە پارتی بگرێ و چاوپۆشی لە هەڵەکانی یەکێتی بکا، ئەوا بە هەمان شێوە، ئەندامانی پارتی دژایەتیدەکەن، ئەندامانی یەکێتیش بە شانوبازویدا هەڵدەدەن، بە پێشکەوتووخواز، ڕووناکبیر و خاوەن هەڵوێستی دادەنێن. چونکە ئەو دوو ڕێکخراوە، وەک چۆن هەموو شتێکیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکردووە، بە هەمان شێوە دەیانەوێ، ڕووناکبیران و نووسەرانیش دابەشکەن، لەو بڕوایە دان، نووسەری بێلایەن نییە و ناشبێ هەبێ، بەڵکوو دەبێ، پشگیریی لایەکیان بکا، یا لەگەڵ لایەکیاندا کاربکا.

بەڵام، گەر نووسەرێ، وابەستەی هیچ لایەکیان نەبێ، لە ڕوانگەی بەرژەوەندیی نەتەوەکەیەوە، کێشە و باسەکان تاووتوێکا، لە بەر ڕۆشنایی ستراتیژی باڵای بزووتنەوەی کوردایەتیدا، لە هەموو ڕووداوەکان بڕوانێ، وەک چۆن هەن، هەر بەو شێوەیەش شییانکاتەوە، لێیان بکۆڵێتەوە و ڕەخنەیان لێ بگرێ، ئەوا ئەو کاتە، ئەندامانی هەر دوو پارتەکە، جۆرە سەنگ و تەرازوویەکی دیکە بەکاردێنن. ئەویش ئەوەیە، سەرەتا کونوقوژبنی نووسینەکەی دەپشکنن، بۆ ئەوەی بزانن، ئەو نووسەرە تا چەن لە یاسای فیفتی فیفتی لایداوە! گەر هەر دوو لایانی وەک یەک داگرتبێتەوە، ئەوا گلەیی ئەوەی لێ دەکەن، چۆن وەک یەک تەماشایاندەکا! ئینجا لە بری ئەوەی بڵێن: فلان نووسەر ڕەخنەی لێ گرتووین، دەڵێن: جنێوی پێ داوین، وەک خوێنەر جیاوازیی لە نێوان ڕەخنە و جنێودا نەکا، یا نەزانێ، کێ جنێوفرۆشە و ئەو خەڵکەی فێری جنێودان و خراپەکاریی کردووە! گەر کەمێ، نووسینەکانیشی لە بەرژەوەندیی لایەکیاندا بێ، ئەوا ئەو لایەنەیان کەمتر سووکایەتی پێ دەکەن. لایەنەکەی دیکەشیان، شەلم کوێرم ناپارێزم، هەرچی خراپە پێی دەکەن. گەر هەر دوولاشیان ڕێکبن و موو بە نێوانیادا نەچێ، ئەوا بە هەر دوولایان لاقیدەگرن، پەلاماریدەدەن و بە تابووری پێنجەم تاوانباریدەکەن.

لەم سەردەمەی ئەوڕۆماندا، نووسەری کورد، بەدەس پارتی و یەکێتییەوە، وەک بەسەرهاتی باوک و کوڕ و کەرەکەی لێهاتووە. دەگێڕنەوە، باوک و کوڕێ کەرێکیان دەبێ. دەیانەوێ، سەردانی گوندێ بکەن. باوکەکە سواری کەرەکە دەبێ، کوڕەکەش بەپێ دەڕوا. لە ڕێگە تووشی کۆمەڵێ خەڵک دەبن، گلەیی لە باوکەکە دەکەن و دەڵێن: تەماشای ئەو پیاوە کەن، چەن دڵی ڕەقە، ملی بە حەوت تەور نابڕێتەوە، کەچی خۆی سواری کەرەکە بووە و ئەو منداڵە چکۆلەیەش بەپێ دەڕوا. پیاوەکە تەریقدەبێتەوە و دادەبەزێ، کوڕەکەی سواردەکا. پاشان کەمێ دەڕۆن و تووشی کۆمەڵێکی دیکە دەبن. دیسانەوە، ئەوانیش پلاری تێدەگرن و دەڵێن: سەیری ئەو منداڵە گەوجە کەن، چەن بێ ڕەوشتە، هیچ شەرم ناکا، خۆی سواربووە و باوکیشی بەو تەمەنەوە بەپێ دەڕوا، گەورە و پچووکی نەماوە! ئەم جارەشیان، لە بەر

قسەی خەڵکیی، کوڕەکە دادەبەزێ. هەر دووکیان پێکەوە تەگبیردەکەن و دەڵێن: بۆ ئەوەی قسەی خەڵکیمان نەیەتەسەر، هەر دووکمان سواردەبین، ئیدی هیچیشمان ماندوو نابین. هەر هێندەیان خۆشدەبێ، ماوەیەکی کەم دەڕۆن، دیسانەوە کۆمەڵێ خەڵکی دیکەیان لێ پەیدادەبێ. هەر لە دوورەوە هاواریان لێ دەکەن و دەڵێن: بە خوا باوک و کوڕێکی دڵڕەق و بێویژدانن، تەماشایانکەن، بە جووتێ زرتەبۆز سواری ئەو گوێدرێژە بەسزمانە بوون. باوک و کوڕەش شەرمەزاردەبن و ئەم جارەش دادەبەزن. لە ناچاریدا، کەرەکە پێش خۆیان دەدەن و هەر دووکیان بە پێ دەڕۆن. دیسانەوە کۆمەڵێکی دیکەیان تووشدەبێ. تەماشایەکیان دەکەن و دەڵێن: تۆ سەیری ئەو باوک و کوڕە کەن، چەن بێ مێشک و گەوجن، ئەو کەرە چاکە بەهێزەیان پێیە، کەچی سواری نابن و بەپێ دەڕۆن. باوکەکەش هیچ چارەیەکی دیکە شک نابا، نازانێ، چی بکا، تا ئەو خەڵکە بێدەنگ بکا و دڵیان ڕازیکا، لە تاوا، یەکسەر پەلاماری کەرەکە دەدا و لە کۆڵێ خۆی دەگرێ، منالەکەش پێش خۆی دەدا. ئیدی لە کۆڵ قسە و پلاری خەڵکی دەبنەوە، چونکە هەر کەسێ دەیانبینێ، لە بەر پێکەنین قسەی بۆ ناکرێ!
ئەز لەو باوەڕەدام، نووسەری بێلایەن و نیشتمانپەروەر، ئەو نووسەرانەن، بە شێوەیەکی بابەتانە و زانستانە دەنووسن، گوێ بۆ سرتە و بۆڵەی تاوانبار و ناپاکان ڕانادێرن. چاویان تیژە و لە بەر پێی خۆیان دوورتر دەبینن. بە هیچ شێوەیە چاوپۆشی لە خراپەی هیچ لایەکیان ناکەن. چاکە و خراپەکانیان لە یەکدی جیادەکەنەوە. دیارە ئەو نووسەرانە، نووسەری ڕێکخراوێکی تایبەتیی نین و نووسەری گەلەکانی خۆیانن. ڕووی دەمی خۆیان، تەنیا لە ڕۆڵەکانی گەلەکەیان دەکەن. بۆیە کاتێ، هەر نووسەرێ، لێفە لە سەر هەڵە و تاوان و ناپاکییەکانیان هەڵدەداتەوە، هیچ لایەکیان ڕێزی لێ ناگرن، چونکە ئەوان نەک هەر ڕێز لە کەسێ ناگرن، لەگەڵیاندا کار نەکا و دەهۆڵیان بۆ نەکوتێ، بەڵکوو گەر هەموو کوردستانیش بسووتێنن، هەموو ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردیش بە کوشتدەن، بە مەرجێ لایەکیان بە سەر لایەنەکەی دیکەیاندا سەرکەوێ، ئەوا ئەوە بە نیشتمانپەروەریی و دڵسۆزیی دادەنێن.

لە ڕاستیدا، هێندێ ڕووناکبیر و نووسەری بێویژدان، ترسنۆک و داخ لە دڵ هەن، لە ژێر پەردەی بێلایەنیی و کوردپەروەریدا، هەمیشە ڕاستییەکان دەشێوێنن. لە بەر هەر هۆیە بێ، لە مێشکی خۆیاندا بە جۆرێ بیردەکەنەوە، لە ڕوو شتێکی دیکە دەڵێن و بە کردەوەش کاری خراپ دەکەن. دیارە ئەو جۆرە ڕووناکبیر و نووسەرانە، کەسانێکی دووڕوو و درۆزنن، خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن، لە نێو کۆمەڵی کوردەواریدا نەبێ، لە نێو هیچ جۆرە کۆمەڵگەیەکی دیکەدا، ڕێزیان لێ ناگیرێ و جێگەیان نابێتەوە، چونکە ڕۆڵێکی گەلێ خراپ وازیدەکەن.
هێندێ ڕووناکبیر و نووسەری دیکەش هەن، خۆیان بە بێلایەن دادەنێن، بەڵام، لە ڕاستیدا بێلایەن نین، بەڵکوو تا سەر ئێسکوپروسکیان، دژایەتی لایەکیان دەکەن، لە بنیشەوە لەگەڵ لایەنەکەی دیکەدا، خۆیان بە یەک ماڵ دەزانن. ئەو جۆرە ڕووناکبیر و نووسەرانەش، جگە لە چەن کەسانێکی ئاژاوەچیی، گێرەشێوێن و دڵڕەش، هیچی دیکە نین. تەنانەت بە شێوەیە دژی ئەو لایەنە دەوەستن، گەر بۆ ڕیسواگردن و سوکایەتیپێکردنی ئەو لایەنە، هێندێ جار، هێندێ کاری ناشیرینیش بکەن، پێیان شەرموشوورەیی نییە!
هەر وەک چەندین جار ڕوونمکردۆتەوە، ئەز لە ڕووی پێوەندیی پارتایەتییەوە، خۆم بە بێلایەن دەزانم. بەڵام، لە ئاستی هیچ کێشە، گرفت، هەڵەوپەڵە، تاوان و ناپاکییەکدا، سەرچاوەکەی لە هەر کوێوە بێ، هەرگیز بێلایەن نەبووم و هەرگیزاوهەرگیزیش بێلایەن نابم، لە ئاستی کارە خراپەکانی ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستاندا، بێ دەنگ نەبووم و نابم، چاو لە هیچ جۆرە کارێکی چەوت نانوقێنم، کە بە زیانی نەتەوەکەم تەواوبێ. هەمیشەش ئامادەم، باجەکەی هەر چەندێ بێ، بیدەم. سەرکەوتن و سەربەرزییش، هەر بۆ ڕووناکبیر و نووسەرە ئازا، خاوەن هەڵوێست و نیشتمانپەروەرە ڕاستەقینەکانە، ژێرکەوتن و سەرشۆڕییش، هەر بۆ ڕووناکبیرە ترسنۆک، بێهەڵوێست، هەلپەرست، چڵکاوخۆر، ناپاک و دوژمنەکانی نەتەوەی کوردە.
بەداخەوە، ئەوڕۆ ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی، وەک تاعون لە ڕیزەکانی گەلی باشوور بە تایبەتیی، نەتەوەی کورددا بە گشتیی بڵاوبۆتەوە. بەشی زۆری خوێنەران، نووسینی نووسەرێکیان لا

پەسەندە و تامۆچێژی لێ وەردەگرن، کە سوکایەتیی بە کەسێ یا لایەنێکی دیاریکراوی ڕامیاریی بکا، ئەگینا ئامادە نین، بەرهەمی نووسەرانی خاوەن ویژدان، دەم و دەس و دڵ و دەروونپاک بخوێننەوە، گوێ بۆ پێشنیازەکانی ڕادێرن.
بەڵام، لەو باوەڕەدام، کەسانێکی بە وێژدان و خاوەن ڕەوشت هەن، ڕاستیی لە هەڵە، هەق لە ناهەق، بێلایەنیی لە لایەنگیریی، ڕەوشت لە بێڕەوشتیی، نیشتمانپەروەریی لە ناپاکیی جیادەکەنەوە، لە ڕاستیی و دروستیی شتەکان تێدەگەن و مافی تەواویی خۆیان دەدەنێ.
گەر ئەوڕۆش، مافی هێندێ نووسەری نیشتمانپەروەر پێشێلکرێ، ئەوا دادگەی مێژوو و نەوەکانی داهاتوو، باشترین دادوەر دەبن و نووسینەکانیش زۆر بە شانازیی و ستایشەوە وەردەگرن، چونکە لە پاشەڕۆژدا، هەموو شتێ بە تەواویی، بۆ ڕۆڵەکانی گەل ڕووندەبێتەوە.
ئەز وەک کوردێکی ناسیۆنالیستی بێلایەن، وەک نووسەرێکی نیشتمانپەروەری کورد، نە لە ژیانمدا، شایەر و زوڕناژەنی هیچ کەس و ڕێکخراوێکی ڕامیاریی بووم، تا بە شانوبازوویاندا هەڵدەم، نە هەرگیز ئەرزوحاڵنووسی هیچ سەرکردەیەکی کوردیش بووم، تا هەڵە، تاوان و ناپاکییەکانیان بۆ پینەوپەڕۆکەم. بەڵکوو، گەر هەستم بە هەر کەموکوڕیی، تاوان و ناپاکییەک کردبێ، یا بە چاوی خۆم بینیبێتم، هەمیشە وەک کامێرایەکی سینەمایی وێنەم گرتوون و زۆر بە دەسپاکییەوە، تۆمارمکردوون. چونکە، نەتەوە و نیشتمانەکەم، سەرچاوەی ژیان و بیرکردنەوەمن، تەنیا هەر بۆ ئەوان دەنووسم. ناتوانم، باسی خەونەکانیان نەکەم، ئێش و ئازارەکانیان پێش چاو نەخەم، بۆیە هەر ئەوانیش بۆیان هەیە، پەنجەی تیژی ڕەخنە، لە چاڵی چاوم بچەقێنن.
گەر مرۆڤێ، تەنیا لاقێکی ژانکا، کاتێ دوکتۆرێ لێی دەپرسی: کوێت دێشێ؟ ناشێ بڵێ، هەر دوو لاقم دێشێ، یا هەموو لەشم دێشێ، بەڵکوو، تەنیا ئاماژە بۆ ئەو جێیە دەکا، کە ئارامی لێ هەڵگرتووە، مەگەر ئەو مرۆڤە تووشی دەرد و پەتایەکی وا بووبێ، بە هیچ دەرمانێ چاری نەبێ، ئینجا بڵێ، هەموو گیانم ژاندەکا!
منیش کە هێندێ جار، پەنجەی ڕەخنە بۆ لایەنێ زیاتر درێژدەکەم،

دیاره ئەو لایەنە، پتر هەڵەیکردووە، پتر ئازاریداوم و هەژاندوومی، پتر زیانی بە نەتەوەکەم گەیاندووە. بەڵام، گەر هەر دوو لایەنەکە، وەک یەک خراپەبکەن، ئەوا دەڵێم: هەر دوو لاقم دێشێ. گەر هەمو لایەنەکانیش، خراپەکاریی بکەن، منیش هەر وەک ئەو نەخۆشەی، تووشی دەردێکی گران بووە و هەموو گیانی دێشێ، هەموو لایەنەکان وەک یەک تاوانباردەکەم.

لە کۆتاییدا دەڵێم: هەموو ئەو کەسانەی، وابەستەی یەکێ لەو ڕێکخراوانەن، لە سەر هەڵوێست و ڕوونکردنەی ڕاستییەکان، هەوڵدەدەن، سووکایەتی بە ڕووناکبیران و نووسەرانی کورد بکەن، ژیانیان پێ تاڵکەن و ئازاریاندەن، ئەوانە پێ بزانن یا نەزانن، لە نێو جەماوەری گەلدا، پلەوپایەیەکی کۆمەڵایەتیی و ڕێزێکی ئەوتۆیان نییە. لە مێژە پەردەیان لە ڕوو هەڵماڵدراوە، ئاسنی سارد دەکوتن و هێندەی دیکەش چارەی خۆیان، لای جەماوەری گەل ڕەشتردەکەن، ئەو کەسەش کەسە، ئەلفێکی بەسە!

ئەم بەرهەمە ڕاپۆرتێ بوو، لە سەر داواکاریی بەڕێوەبەری زانینگەی مەد لە (MED TV)، بۆ کۆنفرانسێکی تایبەتیی ئامادەکرابوو، بەڵام، کۆنفرانسەکە نەگیرا. پاشان لە ڕۆژی (1997/11/30)دا، پوختەیەکی ئەم نووسینەم، لە شاری « ڤێستێڕۆس ـ سوید، ئەمستەردام ـ هۆڵەندە » پێشکەش بە هێندێ، لە کوردە پەنابەرەکانی دانیشتووی ئەو شارانە کرد. دواتریش، هێندێ باسەکەم فراوانترکرد، تا ئەم بەرهەمەی لێ دەرچوو. بەو هیوایەی خوێنەوارانی هێژای نەتەوەکەم، بە باشی لێم تێبگەن، بە قووڵی سەرنجی بۆچوونەکانم بدەن، بە کامی دڵی خۆشیان ڕەخنەی لێ بگرن، بە مەرجێ نەهێڵن، پڕوپاگەندەی ژاراویی ڕێکخراوەکان کاریان تێکا و لە ڕاستە شەقامی کوردایەتیی لایاندا. هیوادارم ئەم بەرهەمەش، وەک بەرهەمەکانی دیکەم، بەو زووانە تیشکی زێڕینی خۆر ببینێ و جێگەی خۆی لە نامەخانەی کوردیدا بکاتەوە.

دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز

ستۆکهۆڵم

1997/12/12

## پێشـــەكیی چاپی دووەم :

دوای ئەوەی، لە(1999/6/2)دا، بۆ مــاوەی سێ مــانگ، ســەردانێكی كــوردســـتــانم كــرد، ناوەڕۆكی ئەم بابەتەم، لە چەن كــۆڕ و چەن جـێگەیەكی جـیـاوازی دیاریكراودا باسكرد. جگە لەوەی بـابەتەكـە بابەتێكی نوێیە، خـوێنەران و گـوێگرانی كـۆڕەكانیش داوایاندەكرد، لە كــوردســتــان چاپكرێتــەوە. چونكە لە چەن دانەیەكی كـەمی نەبێ، تا ئێستـە لە كوردستـان دەس خـوێنەران نەكەوتووە، بۆیە بـڕیارمدا، بە یارمەتیی چەن دۆست و برایەكی ئازیز، بۆ جاری دووەم، لە كوردستان بە چاپی بگەیەنمەوە.
لە ڕاستیدا، بە پێویستم نەزانی، هیچ جۆرە زانیارییەكی نوێی دیكەی بۆ زیادكەم، چونكە باسێكی فراوانم لە سەر جێئۆپۆلیتیكی كوردستان بە دەســـەوەیە. دەمــەوێ، لەوێدا زۆر بە درێژیی لەو بابـەتانـەی لە دوو توێی ئەم بەرهەمــەدا جـێگەیان نەبۆتەوە، لـەوێدا جـێگەیان بكـەمــەوە. بەڵام، بە سـەرلەبەری نووسینەكەدا چوومەوە، هەڵەكانی چاپی یەكەمم ڕاسكردەوە، بە ڕێنووسێكی نوێ نووسیمەوە، تا بە شێوەیەكی جوان و بێ كەموكوڕیی، پێشكەش بە خوێنەرانی هێژای گەلەكەمی بكەم.
لە كۆتاییدا دەمـەوێ، بڵێم: هێندێ لەو پێشبینییانەی لە چاپی یەكەمدا كـرابوون، زۆر بە زیـادەوە هاتنەدی. خـوێنەری وریـاش دەتوانێ، خـۆی سـەرپشكبێ، تاڵی ڕەش و سپی، بۆچوونەكانم لێك جیاكاتەوە!
هیـوادارم، ڕووناكـبـیـر و نووسـەرانـی گـەلەكـەم، بە دڵێكی پاك و بە سنگێكی فراوانەوە، چاپی دووەمی ئەم بەرهەمەم لێ وەرگرن، ئاوڕێكی پڕ لە بەزەییـانە، لـە بەرهەمــەكـەم بدەنـەوە، لە ڕەخنەی دڵســـۆزانە و دروسكەرانە، بێبەشی نەكەن.

ستۆكهۆڵم
1999/09/09

## گرفته سەرەکییەکانی کـــــــــورد

بە باوەڕی من، دەردە سـەرەکـییـە کـوشـندەکـانـی کـورد، لە دوو جـۆرە گرفتی سـەرەکی پێکهـاتوون. ئەو گـرفـتـانەش، جـۆرێکیـان پێوەندیی بە کورد و دراوسـێکانیی و زلهـێزەکـانـی جیـهـانـەوە هـەیە، لە بەر تیشکی کارتێکردنی، فاکتەرە جیۆپۆلیتیکییەکاندا شـیـاندەکەینەوە. جۆرەکەی دیکەشیان، خۆی لە گرفت و پێوەندییـەکـانی نێوخـۆی کورد و کورددا دەنوێنێ. لێرەدا هـەوڵدەدەین، لە پێشـدا، سـروشـتی هـەموو گرفتەکان دیاریکەین، لـە یەکـدیان جـیـاکـەینەوە و بە جـیـا لـە هـەر یەکـەیان بکۆڵینـەوە. پاشـــان بەپێی تـوانـا، پێـــشـنـیـــازی گـــونـجـــاو بۆ چارەسەرکردنیان پێش چاو دەخەین.

### یەکەم ـ گرفتەکانی نێوان کورد و دراوسێکانی :

لە نـاوچەی خـۆرهـەڵاتـی نـاوەنددا بە گـشـتـیی، لە دەوڵەتـەکـانـی تورکیا، ئێـران، عێراق و سـووریادا بە تایبـەتیی، جگە لە چـەڵەمـە ڕامیـاریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، ئاینیی و ئایینزاییەکـان، سێ گرفتـی گەورە و گرانی سـەرەکیی و گرنگی دیکە هـەن. هـەر سێ گرفتە سـەرەکییەکەش، ڕەگی قووڵیان لە کوردستاندا داکوتاوە. ئەو گرفتانەش ئەمانەن :

#### ١/ گرفتی نەتەوەیی :

بە شێوەیەکی گشـتـیی، لەو ڕۆژەوە کـــوردەکـان، دەسەڵاتی میدیایان لە دەسداوە، واتە: دەورووبەری (2500) ساڵێ لەمەوبەر، دواتریش کاتێ عـــەرەبە ئیـــســـلامـــەکـــان، (1400) ســـاڵ لەمـــەوبـەر، ناوچـەکـەیان داگیرکردووە، بە تایبـەتیی لەو ڕۆژەوە، بناغـەی هـەر دوو ئیمپراتۆریا گـەورە دەسـەڵاتدارەکـەی ڕۆژهـەڵات، « سـەفـەویی » لە سـەر بنچـینەی ئایینزای شیـعە، لە وولاتـی فـارسـی کـۆن، لە (1501ز) و ئێرانی ئەوڕۆ دامەزرا، « عوسمانیی » لە بەر ڕۆشنایی ئایینزای سوننی لە تورکیای

کۆن، له (1299) له ناوچەکەدا دروستبوو، ئەم گرفته سەریهەڵداوه و تا ئەوڕۆش، بێ چارەسەرکردن ماوەتەوه. به تایبەتیی دوای هەر دوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهان (1914-1918) (1939-1945)، هێندەی دیکه، گۆمی بێ ئارامی ئەو گرفتانه قووڵبوونەتەوه و شڵەقێنراون. گرفته نەتەوەیی یەکانیش، پتر خۆیان لەوەدا دەبینن، چەن دەوڵەتێکی تێریتۆریاڵ ـ واته: فره نەتەوه و نیشتمان، له سەر داروپەردووی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەند دامەزراون، ئەو گەلانەیان له چوارچێوەی گرتووخانەی دەوڵەتەکانیاندا دیلکردووه، سەربەخۆیی و ئازادیی نەتەوەیی یان پێشێلکردوون و نوزەیان لێ بڕیوون، واته: له پچووکترین مافه دێمۆکراسیی، نەتەوەیی و مرۆیی یەکانی خۆیان بێ بەشیانکردوون. گرفته نەتەوەیی یەکانیش، له بەر ڕۆشنایی پێوەندییەکانیان به نەتەوەی کورد و چوار دەوڵەتەکەوه، به سەر دوو دەستەدا دابەشدەکەین :

## 1. گرفتی گەل و کەمینه نەتەوەیی یەکانی نێو سنووری چوار دەوڵەتەکه

لێرەدا گرفتەکه لەوەدایه، هەر چوار دەوڵەته داگیرکەرەکه، خۆیان به چوار دەوڵەتی ناسیۆنال دادەنێن. چونکه نەتەوه سەردەستەکان، جگه له خۆیان، دان به بوون و مافی هیچ یەکێ لەو گەلانەی بندەستیاندا نانێن. بۆیه دەڵێن: گەلی (تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا)، هەرگیز زاراوەی گەلانی (تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا) بەکار ناهێنن. بەڵام، ئەوان بیانەوێ و نەیانەوێ، ئەو چوار دەوڵەته، بەپێی پێناسەکانی جوگرافیای ڕامیاریی و یاسای نێودەوڵەتان، چوار دەوڵەتی تێریتۆریاڵ پێکدەهێنن. گرفتی گەل و کەمینه نەتەوەیی یەکانیش، پتر خۆیان لەم چەن نموونانەی لای خوارەوەدا دەبینن :
له تورکیا، گرفتەکانی تورک لەگەڵ (کورد، ئەرمەن، ئاسووریی، سریانیی، لاز، چەرکەس و عەرەب). له ئێران، گرفتەکانی فارس لەگەڵ (کورد، بلوچ، تاژیک، ئەفگان، ئازەر، تورکمان و عەرەب). له عێراق، گرفتەکانی عەرەب لەگەڵ (کورد، تورکمان و ئاسووریی). له سووریا، وەک گرفتی (عەرەب و کورد).

# 2. گرفتی گەل و کەمینە نەتەوەیی یەکان لە کوردستاندا

لە باکووری کوردستان، وەک گرفتەکانی کورد لەگەڵ (تورک، ئەرمەن، ئاسووریی و لاز). لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، وەک گرفتی کورد لەگەڵ (ئازەر، فارس، ئەرمەن و ئاسووریی). لە باشووری کوردستان، وەک گرفتی کورد لەگەڵ (تورکمان، عەرەب، ئەرمەن و ئاسووریی). لە خۆراوای کوردستان، وەک گرفتی( کورد و عەرەب).
دیارە ئەو گرفتانە، وەک سەرچاوەیەکی ئاژاوە و نائارامیی، بە شێوەیەکی بەردەوام، هەموو دینگە سەرەکییەکانی هەر چوار دەوڵەتەکە دەلەرزێنن و بارودۆخی ناوچەکە و جیهانیش دەشڵەقێنن. زۆر کات لە لایەن لایەنێکەوە، یا دەوڵەتێکەوە دەوروژێنرێن و ئاگری جەنگی نێوخۆ، یا جەنگی نێوان دوو دەوڵەت، لە ناوچەکەدا هەڵدەگیرسێ.
تاقیکردنەوەکانی پتر لە حەفتا ساڵی، دوای جەنگی یەکەمی جیهان، چ لە کوردستان و چ لە هەندەران، ئەوەیان سەلماندووە، چارەسەری نیوەناچڵی نەتەوەیی، وەک (مافی کەلتووریی، ناناوەندێتی، ئۆتۆنۆمیی، ئۆتۆنۆمیی نێودەوڵەتیی و فیدراڵیی)، چارەسەری کێشەی کورد و گەلانی دیکەی ناوچەکە ناکا. چونکە، گەلە سەردەسەکانی ناوچەکە، لە ڕووی شارستانییەوە، لە چەن گەلێکی دواکەوتوو پێکهاتوون. لە ڕووی ئازادیی و دێمۆکراسییەوە، تا ئەوڕۆ بە هیچ جۆرێ، دێمۆکراسیی نین و بڕوایان پێ ناکرێ. ئەو دەوڵەتانە، وەک چەن دەوڵەتێکی دیکتاتۆریی، تۆتالیتێر و ڕەفتار فاشیی هەڵسوکەوتدەکەن. لەبەرئەوە، کێشەی نەتەوەیی، بەو گەلە دواکەوتوو و دەوڵەتە سەرکوتکەرانە، چارەسەر ناکرێ. سەیر ئەوەیە، هەر کاتێ ئەو دەوڵەتانە، تووشی گرفتێکی نێوخۆیی و دەرەکیی دەبن، وەک هەنگاوێکی تاکتیکیی، چارەسەرێکی کاتیی بۆ کێشەکان دەدۆزنەوە. بەڵام، هەر لەگەڵ ئەو هۆکارانە نەمان، ئیدی بە خراپترین شێوە، بۆ سەر ڕەوشتە کۆنەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە و پەلاماری بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی گەلانی بندەسیان دەدەنەوە. بۆیە، تەنیا ڕێ ئەوەیە، کێشەی گەلانی ناوچەکە،

به شێوەیەکی بنەڕەتیی و بۆ تاهەتایە، چارەسەرێکی ڕادیکاڵانەی بۆ بدۆزرێتەوە. ئەویش، بە هەڵوەشاندنەوەی قەوارەی ڕامیاریی، هەر چوار دەوڵەتە تێریتۆریاڵاکە دێتە دی. واتە: سەرەتا دەبێ، هەموو لاکان، دان بە مافی چارەنووسی گەلانی ناوچەکەدا بنێن، مافی سەربەخۆیی خۆیان بدەنێ. ئەو مافەش تەنیا، خۆی لە دامەزراندنی چەن دەوڵەتێکی ناسیۆنالی نوێدا دەنوێنێ.
بۆ ئەم کارەش پێویستە، ئەفسانەی پیرۆزیی، هەڵ نەوەشاندنەوە، نەگۆڕان و تێک نەدانی سنوورەکان گۆڕکرێ. چونکە، وەک ئاشکرایە، هیچ سنوورێ پیرۆز نییە و تا سەریش نەگۆڕ نییە. کێ دەیزانی، ئەو سنوورە دەسکردانەی دەوڵەتەکانی (یەکێتی سۆڤیەت، یۆگۆسلاڤیا، چیکۆسلۆڤاکیا، ئەسیوبیا و ... تاد)، ڕۆژێ لە ڕۆژان هەڵدەوەشێندرێنەوە؟! هەر چەندە ئەو دەوڵەتانە، وەک چەن دەوڵەتێکی تێریتۆریاڵ، جۆرە سەربەستییەکی نەتەوەیی تێدابوو، مافی چارەنووسی گەلانی نێو چوارچێوەی ئەو دەوڵەتانە، (جگە لە گەلی ئەرتیریا)، تا ڕادەیەک لە (ئۆتۆنۆمیی - فیدراڵیی)دا ڕاگەیەنرابوو. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، هەر هەڵوەشێنرانەوە، لە سەر داروپەردووی ئەو دەوڵەتە تێریتۆریالانەش، چەندین دەوڵەتی ناسیۆنال دامەزران، جەنگی سێیەمی جیهانییش هەڵ نەگیرسا و دنیاش کاول نەبوو، وەک هێندێ لە سەرانی کورد، بیری لێ دەکەنەوە! جا لەبەرئەوەی، گەلانی بندەستی ئەو چوار دەوڵەتە، تەنانەت ئەو جۆرە ئازادیی و مافانەشیان نییە، کە گەلانی ئەو دەوڵەتە ناوبراوانەی پێشوو هەیان بووە، ئیدی بۆ دەبێ، مل بۆ باری سەپاو بدەین، بەو بارودۆخە نالەبارە خراپ و چەوساندنەوە نەتەوەیی یە قایل بین؟ بۆ دەبێ، سنووری چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکە، تێک نەدرێنەوە و لە جێگەیان، چەن دەوڵەتێکی ناسیۆنال دانەمەزرێندرێن؟!
دوور نییە، هێندێ لە پیاوە ڕامیارییە کلاسیکییەکانی کورد، بڵێن: بارودۆخی نێونەتەوەیی لەبار نییە، دەوڵەتە زلهێزەکانی جیهان، ئەو پلانە قەبوڵ ناکەن و بەو نەخشە نوێیەی ڕۆژهەڵاتی ناوەند ڕازی نابن. لە وەڵامدا دەڵێم: ئەوە پتر لە بیانوو دەچێ. چونکە، کەی گەلانی ناوچەکە، داوای ئازادیی و سەربەخۆیی تەواویی نەتەوەیی خۆیان

کردووه، کەی هەوڵیان بۆ دامەزراندنی چەن دەوڵەتێکی ناسیۆنالی سەربەخۆ داوە، تا ئەوان قایل نەبن؟! خۆ گەر لە سەرەتاشدا دژبن، ئەوا کاتێ جەماوەری ئەو گەلانە، لە سەر داواکارییە ڕەواکانی خۆیان پێ دادەگرن، ئەوانیش کۆڵدەدەن و ناچاردەبن، بیر لە چارەسەرێکی بنەبڕیی بکەنەوە، چیدیکە دژ نەبن و دان بە مافە ڕەواکانی گەلانی ناوچەکەدا بنێن. لەم بوارەدا، تاقیکردنەوەی گەلانی (ئێستلاند، لێتلاند، لیتوانیا و ئەرتیریا)مان هەیە. سەرەتا دەوڵەتە زلهێزەکان، هەموویان دژی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی ئەو گەلانە بوون. بەڵام، کاتێ ئەو گەلانە، لە سەر داواکارییە ڕەواکانی خۆیان سووربوون، ئەوانیش ناچاربوون، کۆڵبدەن و پشگیرییانبکەن، ئەوڕۆش هەموویان، لە چوارچێوەی سنووری دەوڵەتە ناسیۆنالەکانی خۆیاندا، بە ئازادیی و سەربەخۆیی دەژین.

شتێکی ئاشکرایە، تەنیا گەلی کورد، لەو دەوڵەتە تێریتۆریالانەدا، لە ژێر باری ئەشکەنجە، ژان و ئازاری چەوساندنەوەی نەتەوەییدا نانالێنێ. بەڵکوو، هەموو گەلە بندەسەکان و کەمینەنەتەوەیی یەکانیش، وەک کورد لە پرینسیپەکانی مافی مرۆ، دێمۆکراسیی و نەتەوەیی بێبەشکراون. واتە: لێرەدا دەتوانین، خاڵێکی نێوکۆیی و هاوبەش، لە نێوان گەلانی بندەسی هەر چوار دەوڵەتەکەدا بدۆزینەوە. ئەویش پتر لە چەوساندنەوەی نەتەوەیی و سەرکوتکردنی جولانەوە شۆڕشگێڕییەکانی، گەلانی نێو سنووری چوار دەوڵەتەکەدا دەردەکەوێ. بە واتایەکی دیکە، بەرژەوەندیی هاوبەشی ئەو گەلانە لەوە دایە، هەموو یەکگرن و دژی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانە خەباتبکەن، چونکە، دوژمنی سەرەکییان، هەر یەک دوژمنە. بۆیە پێویستە، هەموو هەوڵ، وزە و تواناکان کۆکرێنەوە و لە چوارچێوەی بەرەیەکی ئینتەرناسیۆنالی بەرچاوڕوونی پێشکەوتووخوازانەدا ڕێکخرێن. لە سەر بەرنامەیەکی هاوبەش ڕێککەون، کە بنەما سەرەکییەکانی، لە سەر ڕێزی بەرابەریی، یەکسانیی و دانان بە مافی چارەنووسی یەکدیدا دامەزرابێ.

لەم بوارەدا، نەتەوەکەمان هێندێ ئەزموونی باشی هەیە. بۆ نموونە: لە باکووری کوردستان، گەلی کورد دەتوانێ، دژی دەوڵەتی داگیرکەری

تورک، دەسی هاوکاریی و خەبات، لە نێو دەسی دراوسێ ئەرمەنەکانی بنێ، لە پێناوی دامەزراندنی دوو دەوڵەتی ناسیۆنالی ئەرمەنستان و کوردستاندا، پێکەوە خەباتبکەن. وەک ئەوەی، لە دوای جەنگی یەکەم، لە نێوان نوێنەرانی هەر دوو گەلی کورد و ئەرمەن، (ژەنەراڵ مستەفا پاشا و نۆبەهار پاشا) لە پاریس ڕوویدا.
نموونەیەکی دیکە ئەوەیە، لە دوای جەنگی دووەمی جیهان، بە یارمەتیی یەکێتی سۆڤیەت، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئازربایجان، دوو کۆماری دیمۆکراسیی دامەزرا. پاشان، لە نێوان سەرکردەکانی هەر دوو گەلی کورد و ئازەردا، ڕێککەوتننامەیەکی هاریکاریی دۆستانەی ستراتیژیی پەنجەمۆرکرا، تا پێکەوە بە ئازادیی و ئارامیی بژین و داکۆکیی لە دەسدرێژییەکانی دەسەڵاتی ناوەندیی تاران بکەن.
هەر چەندە، هەر دوو ئەزموونەکە، لە ئەنجامی چەن فاکتەرێکی دیاریکراودا، زۆر نەژیان و هەر زوو جوانەمەرگکران. بەڵام، لەبەرئەوەی تا ئەورۆ، لە هەر چوار دەوڵەتەکەدا، چەوساندنەوەکە هەر بەردەوامە و گرفتەکانیش بێ چارەسەرکردن ماونەتەوە، نەتەوەی کورد دەتوانێ، لە ڕێی ڕێکخراوە ڕامیارییەکانییەوە، کەڵک لەو تاقیکردنەوە مێژوویی یانە وەرگرێ، زیندوویانکاتەوە، پتر دەوڵەمەندیانکا و پەند لە هەڵەکانیان وەرگرێ، تا جارێکی دیکە، ئەو هەڵە و تێکشکاندنانە، دووبارە نەبنەوە و تاقیکردنەوەکانیش، بە باشترین شێوە سەربگرن، سەرلەنوێ پێوەندییەکانی خۆی، لەگەڵ ئەو گەلانەدا دامەزرێنێتەوە و پتەویانکا.
هەموومان دەزانین، وەک چەندین ساڵە دەڵێین: کوردستان تەنیا موڵکی کورد نییە، بەڵکوو لە هەر بەشێکی کوردستاندا، چەندین کەمینەی نەتەوەیی دیکە دەژین. پێویستە سەرانی کورد، بەرنامەیەکی ڕێکوپێکی مرۆپەروەرانە لەبەرچاوگرن، بە مەرجێ مافە (مرۆیی، نەتەوەیی، دیمۆکراسیی، فەرهەنگیی و دەستووری)یەکانی، ئەو کەمینە نەتەوەیی یانەی تێدا ڕەچاوکرێ، تا لە هەر پارچەیەکدا، تێکۆشانیان بە تێکۆشانی گەلی کوردەوە، بە باشترین شێوە گرێدرێ و دژی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانە، بۆ خەباتکردن هاندرێن. چونکە، لە لایەکەوە قەوارەی ڕامیاریی ئەو دەوڵەتە تێریتۆریالانە، تەنیا بە کورد هەڵ

ناوەشێنرێنەوە. گەر ئەو گەل و کەمەنەتەوەیی یانەی کوردستان، لەو خەباتەدا بەشدارییبکەن، گەر هەموو گەلانی ژێردەستی ئەو دەوڵەتانە، بە یەکجار داوای دامەزراندنی دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان بکەن، ئەوا کێشەی هەڵوەشاندنەوەی ئەو چوار دەوڵەتە تێریتۆریالانەش، ئاسانتردەبێ. هەروەها، بەرنامەی کوردستانی مەزنیش، تەنیا بە نەتەوەی کورد جێبەجێ ناکرێ، دەوڵەتی ناسیۆنالی کوردستانیش، تەنیا بە نەتەوەی کورد دانامەزرێ. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو چوار دەوڵەتە داگیرکەرە، گەلێ بە توانا و بەهێزن، تا دوژمنیان زۆرتربێ، بۆ نەتەوەی کورد باشترە و کارەکەی ئاسانتردەبێ. جگە لەوەی، سەرنج و بیروباوەڕی گەلانی جیهانیش، بە لای کێشە سەرەکییەکەماندا، پتر ڕادەکێشین و پشتگیریی و هاریکارییەکی ئینتەرناسیۆنالانە، بۆ خۆمان مسۆگەردەکەین. بۆیە دەبێ، خەباتێکی زۆر لەو بوارەدا بکرێ، توانا و هێزی (نەتەوەیی، ڕامیاریی، دیپلۆماسیی، ئابووریی و سەربازیی)، هەموو گەلانی چەوساوە و بندەستی ئەو چوار دەوڵەتە، لە بەرەیەکی پێشکەوتووخوازانەی ئازادیخوازانەدا کۆکرێنەوە، ڕێکخرێن و دژی دەوڵەتە داگیرکەرەکان بەگەڕخرێن.

## فاکتەرەکانی هێزی نەتەوە

سەرانی کورد دەبێ، زۆر بە کوڵودڵەوە، فاکتەرەکانی جیۆپۆلێتیکی کوردستان، لەبەرچاوگرن. دیارە ئەو فاکتەرانەش، وەک چەن فاکتەرێکی هێزی نەتەوە، حسێبیان بۆ دەکرێ. فاکتەرەکانیش پتر خۆیان لە (خاک، دانیشتووان و سەرچاوە سروشتییەکان)دا دەبینن. هەر سێ فاکتەرەکەش، بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانیی سەربەخۆ و یەکگرتوو، شایانی ئەوەن، باسکرێن و پشتیان پێ ببەسرێ.

بەپێی ئەو سەرچاوانەی ئەوڕۆ لە بەر دەسدان، ڕووبەری جیهان (509 000 450) کیلۆمەتری چوارگۆشە ـ کچگ دەبێ. (000 000 360) کچگ لە ئاو و (000 450 149) کچگ لە وشکانیی پێکهاتووە. هەموو جیهان بە سەر پێنج کیشوەری سەرەکیی و گەورەی وەک (ئاسیا،

ئەوروپا، ئەفریکا، ئەمێریکا و ئوستراليا)دا دابەشکراوە. گەورەترین کیشوەر بە ئاسیا و پچووکترینیشیان بە ئوسترالیا دادەنرێ.
جگە لە رووبەری تەوەری خواروو (Antarctic-14 100 000) ڕووبەری هەر پێنج کیشوەرەکەش بەڕیز، لە (ئاسیا ـ 44 500 000 ، ئەوروپا ـ 9 957 000، ئەفریکا ـ 30 302 000، ئەمێریکای سەروو ـ 24 241 000، ئەمێریای خواروو ـ 17 793 000 و ئوستراليا و ئۆقیانووسەکانیش ـ 8 557 000) کچگ پێکهاتووە.«4،10» لەو پێنج کیشوەرە گەورە و پانوپۆڕەی جیهانیشدا،(192) دەوڵەتی گەورە و گچکە، زەریایی و کیشوەریی، ناسیۆنال و تێریتۆریال هەیە. پتر لە (185) دەوڵەتیان، لە دەزگەی کۆمەڵەی نەتەوە یەککرتووەکاندا، مافی ئەندامێتیان پێ بەخشراوە. ژمارەی دانیشتووانی جیهان، لە نێوان (5.5 - 6.0) ملیار دایە.
گەر ڕووبەری خاک و ژمارەی دانیشتووانی، هەر یەکێ لەو دەوڵەتانە، لەگەڵ ڕووبەری خاکی کوردستان و ژمارەی نەتەوەی کورددا بەراوردکەین، ئەوا ڕووبەری (142) دەوڵەت، لە ڕووبەری خاکی کوردستان پچووکترن. ڕووبەری دوو دەوڵەتی وەک (ئیسپانیا ـ 504.750 کچگ و تایلاند ـ 513.115 کچگ) نزیکەی وەک یەک وان. بەلام، تەنیا ڕووبەری (48) دەوڵەت، لە ڕووبەری خاکی کوردستان گەورەترن. لە ڕووی ژمارەی دانیشتووانیشەوە، ژمارەی دانیشتووانی (163) دەوڵەت، لە ژمارەی نەتەوەی کورد کەمترن. تەنیا ژمارەی دانیشتووانی (29) دەوڵەت، لە ژمارەی نەتەوەی کورد زۆرترن. لەو ڕووبەرە پانوپۆڕەی جیهانیش، پتر لە (500 000) کچگ بەر کوردستان دەکەوێ. ژمارەی نەتەوەی کوردیش لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستان، پتر لە (30 000 000) مرۆڤ دەبێ.
زاناکانی جوگرافیای ڕامیاریی، هەموو دەوڵەتەکانی جیهان، بەپێی ڕووبەرەکانیان، بە سەر حەوت گروپدا دابەشدەکەن. بەپێی ئەو دابەشکردنە بێ، کوردستان وەک وولاتێ، لە ڕووی فراوانیی ڕووبەری خاکەوە، لە دەستەی سێیەمدا پۆلێندەکرێ. هەر وەک لە خشتەی ژمارە « 1 » دا دەردەکەوێ. گەر تەنیا ڕووبەری خاکی کوردستان، وەک فاکتەری خاک وەرگرین، ئەو ڕووبەرەش بە (500 000) کچگ دانێین،

بەراوردێ لە نێوان ڕووبەری خاکی کوردستان و چەن دەوڵەتێکی جیهاندا بکەین، ئەوا دەبینین، ڕووبەری خاکی کوردستان، چەندین جار لە ڕووبەری ئەو دەوڵەتانە گەورەترە، وەک لە خشتەی ژمارە « 2 » دا پیشانیدەدەین.
گەر ژمارەی دانیشتووانی کوردستانیش، وەک فاکتەری دووەم وەرگرین، ئەوا گەلێ لە ژمارەی دانیشتووانی، هێندێ لە دەوڵەتەکانی جیهان زۆرترە. وەک لە خشتەی ژمارە « 3 »دا دەیبینین. لە هەمان کاتیشدا، گەر ژمارەی نەتەوەی کورد لە جیهاندا، تەنیا بە (30) میلیۆن بقەبلێنین، بەراوردێ لە نێوان ژمارەی کورد و ژمارەی دانیشتووانی چەن دەوڵەتێکی جیهاندا بکەین، ئەوا دەبینین، ژمارەی کورد لە چاو ژمارەی دانیشتووانی ئەو دەوڵەتانەدا، چەندین جار زیاترە، وەک لە خشتەی ژمارە « 4 » دا دەردەکەوێ. کەچی ئەورۆ نەتەوەی کورد،(لە هەموو جۆرە مافێکی نەتەوەیی و دێمۆکراسیی و مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ بێبەشکراوە)«122،2» و خاوەنی دەوڵەتێ ناسیۆنالی خۆشی نییە.
بەپێی سەرژمێرێکی تایبەتیی، ساڵی1991 لە گۆڤاری (Kurdish Times) لە ئەمێریکا بڵاوکراوەتەوە،(کورد لە ماوەی سی ساڵی داهاتوودا *، دەبێتە دووەمین نەتەوەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، لە مەزنی ژمارەیدا لە پاش عەرەب دێ. ئەو دەم کۆی ژمارەی کورد لە هەموو کوردستاندا دەگاتە نزیکەی 65.9 میلیۆن)«2،5».
لە ڕووی سەرچاوەی سروشتیشەوە، وەک فاکتەری سێیەمی هێزی نەتەوە، کوردستان بە یەکێ لە وولاتە هەرە دەوڵەمەندەکانی، ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەند دادەنرێ. دەشتاییەکی زۆر و خاکێکی بەپیتی هەیە، ئاووهەوایەکی جۆراوجۆری هەیە. بەو هۆیەوە دەتوانرێ، چەندین جۆر کشتوکاڵی جیاوازی وەک بەروبوومی کێڵگە، سەوزە و میوەی تێدا بڕوێنرێ. سەرچاوەیەکی ئاوی زۆری هەیە، هەم بۆ خواردنەوە، هەم بۆ کشتوکاڵ، هەم بۆ وزەی کارەبا و پرۆژە پیشەسازییەکان بەکاربێنرێ.

---

* واتە: ساڵی2020 ، ژمارەی نەتەوەی کورد بەو شێوەیە زیاددەکا.

هەروەها، خاوەنی سەرچاوەیەکی سروشتیی، وزەیەکی مەزن و لەبن نەهاتووی وەک (نەوت، گازی سروشتیی و خەڵوزی بەردینە). جگە لەوەی، ژێر زەوییەکانی خاکی کوردستان، بە چەندین جۆر کەرەسەی خاو و کانزای بریسکەدار و نابریسکەداری بە نرخ و گرانی وەک (ئاڵتون، زیو، نیکل، ئەلەمنیۆم، ئاسن، مس، مەنگەنیز، گۆگرد، فۆسفات، قورقوشم و یۆرانیۆم ...) سیخناخکراون و هێندەی دیکە وڵاتەکەیان دەوڵەمەندکردووە، کە دەتوانرێ، بە هۆیانەوە بازرگانییەکی گەورەی نێوخۆیی و دەرەکیی دابمەزرێنرێ و پیشەسازییەکی قورسی پێشکەوتووخوازانە بهێنرێتە کایەوە.

هەروەها، چەندین کەرەسەی خانووبەرەی وەک (مەڕمەڕ، بەرد، گەچ، خۆڵ، زیخ، لم و چەو)ێکی زۆر لە کوردستاندا هەن، بۆ مەبەسی تایبەتیی و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکە دەسدەدەن.

ئەم سێ فاکتەرەی هێزە جیۆپۆلێتیکییەی کوردستان هەیەتی، گیانێکی مەزن و پیرۆز، بە بەر جەستەی نەتەوەکەدا دەکا، هێز و دەسەڵاتێکی بێ ئەندازە، بە دەوڵەتی پاشەڕۆژی کوردستان دەبەخشێ. (بۆیە پێویستە، لێکدانەوەیەک، شیکردنەوەیەکی نوێ، بۆ بارودۆخی نەتەوەی کورد بکرێ، چارەسەرێکی بنەڕەتیی بۆ تاهەتایە، بۆ کێشە ڕەواکەی بدۆزرێتەوە.)«122،2»

## خشتەی ژمارە « 1 »

بەراوردکردنی ڕووبەری دەوڵەتەکانی جیهان، لەگەڵ ڕووبەری کوردستاندا. (500 000 کچگ) « 57،8 »

| گروپ | ژمارەی دەوڵەت | نموونە | ڕووبەر/کچگ |
|---|---|---|---|
| یەکەم | 06 | ئەمێریکا، ئوستراليا و ڕووسیا | (7.7 - 17.0)م |
| دووەم | 11 | هیندستان، مەکسیک و لیبیا | (1.7 ـ 3.3 )م |
| سێیەم | 57 | ئەڵمانیا، فرەنسا و میسر | 280 هـ ـ 1.3 م |
| چوارەم | 50 | بریتانیا، تونس و کوبا | (51 ـ 260 ) هـ |
| پێنجەم | 25 | یۆگۆسلاڤیا، سویسرا و تایوان | (20 ـ 50) هـ |
| شەشەم | 36 | قوبرس، لوبنان و سینگاپورە | 250 ـ 19 هـ |
| حەوتەم | 07 | سان مارینۆ، مۆناکۆ و ناورو. | 0.44 ـ 250 |
| کۆ | 192 | | |

تێبینـــی :
لەبەرئەوەی ناوی هەموو دەوڵەتەکانی جیهان، لێرەدا جێی نەبۆوە، لە هەر گروپەی تەنیا ناوی سێ دەوڵەتمان وەک نموونە وەرگرت.
م ـ میلیۆن
هـ ـ هەزار

خشتەی ژمارە « 2 »

بەراوردکردنی ڕووبەری کوردستان، لەگەڵ ڕووبەری هێندێ لە دەوڵەتەکانی جیهاندا.

| کیشوەر | ژمارەی دەوڵەت | پچووک | گەورە | نموونە | گروپ | ڕووبەر کچک | جیاوزایی کچک |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئاسیا | 46 | 33 | 13 | مالدیڤ | 6 | 288 | 1736 |
| ئەورووپا | 44 | 40 | 04 | ڤاتیکان | 7 | 0.44 | 113 636 |
| ئەفریقا | 53 | 31 | 22 | سێیشێلێر | 6 | 453 | 1104 |
| ئەمێریکا سەروو | 23 | 20 | 03 | کیتیس نیڤیس | 6 | 269 | 1859 |
| ئەمێریکا خواروو | 12 | 05 | 07 | سورینام | 4 | 163.820 | 3.0 |
| ئوستralیا | 14 | 13 | 01 | ناورۆ | 7 | 21 | 23 809 |
| کۆ | 192 | 142 | 50 | | | | |

بۆ نموونە: لە کیشوەری ئاسیادا، (46) دەوڵەت هەیە،(33) دەوڵەتیان لە ڕووبەری کوردستان پچووکترن، (13)دەوڵەتیان یان گەورەترن. وەک (مالدیڤ) لە ڕووی ڕووبەرەوە لە گروپی شەشەمدا پۆلێندەکرێ. ڕووبەرەکەی (288) کیلۆمەتری چوارگۆشەیە. واتە: ڕووبەری کوردستان (1736 ) جار لە ڕووبەری (مالدیڤ) گەورەترە.

خشتەی ژمارە « 3 »

بەراوردکردنی ژمارەی دانیشتووانی دەوڵەتەکانی جیهان، لەگەڵ ژمارەی دانیشتووانی کوردستاندا. (30میلیۆن) « 10 »

| کیشوەر | نموونەی دەوڵەت | ژمارەی دانیشتووان |
|---|---|---|
| ئاسیا | ئەرمینیا ، نیپاڵ، کۆریای سەروو و مالیزیا | 252 هـ ـ 23م |
| ئەوروپا | دانیمارک، ڕۆمانیا ، هۆڵەندا و پورتوگال | 1000 ـ 23 م |
| ئەفریقا | جەزایر، سۆماڵ، گامبیا و کۆنگۆ | 72 هـ ـ 28م |
| ئەمێریکا سەروو | کەنەدا، نیکاراگوا، پەنەما و جامایکا | 40.7 هـ ـ 28 م |
| ئەمێریکا خواروو | ڤنزەوێلا ، پیرۆ ، بۆلیڤیا و چیلی | 423 هـ ـ 23.7 م |
| ئوستراليا | ئوستراليا ، ناورو ، پالاو ، و نیوزیلاند | 10هـ ـ 18م |

هـ ـ هەزار
م ـ میلیۆن
لێرەدا تەنیا ، هێندێ لە نموونەی دەوڵەتە جیاوازەکانی هەر پێنج کیشوەرەکەی جیهان پیشاندراون، کە ژمارەی دانیشتووانیان، لە ژمارەی نەتەوەی کورد کەمترن.

خشتەی ژمارە « 4 »

بەراوردکردنی ژمارەی کورد لەگەڵ ژمارەی دانیشتووانی هێندێ لە دەوڵەتەکانی جیهان. (ساڵی 1994)« 10 »

| کیشوەر | ژمارەی دەوڵەت | کەم | پتر | نموونە | گروپ | ژمارەی دانیشتووان | جیاوزایی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئاسیا | 46 | 34 | 02 | مالدیڤ | 6 | 252 هـ | 119 |
| ئەورووپا | 44 | 36 | 08 | ڤاتیکان | 7 | 1 هـ | 30 هـ |
| ئەفریقا | 53 | 48 | 05 | سێیشێلێ | 6 | 72 هـ | 417 |
| ئەمێریکا سەروو | 23 | 21 | 02 | کیتس نیڤیس | 6 | 41 هـ | 378 |
| ئەمێریکا خواروو | 12 | 09 | 03 | سورینام | 4 | 423 هـ | 71 |
| ئوستورالیا | 14 | 14 | 00 | ناورۆ | 7 | 10 هـ | 3 هـ |
| کۆ | 192 | 162 | 30 | | | | |

هـ ــ هەزار

بۆ نموونە: لە کیشوەری ئەورووپادا، (44) دەوڵەت هەیە. ژمارەی دانیشتووانی (36) دەوڵەتیان لە ژمارەی کورد کەمترن و تەنیا (8 )دەوڵەتیان زۆرترن. وەک (ڤاتیکان )لە گروپی (7) دا پۆلێندەکرێ. ژمارەی دانیشتووانی یەک هەزار کەسە. واتە: ژمارەی کورد (30) هەزار جار لە ژمارەی دانیشتووانی (ڤاتیکان) زیاترە.

## 2/ گـــــرفتی وزه :

بە شێوەیەکی گشتیی، ئەو وولاتانەی لە ڕووی سەرچاوە ئابووریی یە سروشتییەکانەوە دەوڵەمەندن، گەلەکانیان بە تێروتەسەلیی، بەختەوەریی، سەروەریی و سەرفرازیی دەژین. بە پێچەوانەشەوە، ئەو وولاتانەی لە ڕووی ئەو سەرچاوانەوە هەژارن، ناتوانن، بە شێوەیەکی بەردەوام و ڕێکوپێک، خۆراکی دانیشتووانی وولاتەکانیان دابینکەن، برسێتیی، بێکاریی، نەخۆشیی، نەزانین، هەژاریی و چەرمەسەریی ڕوویان تێدەکا. بۆیە ناچاردەبن، دەس لە دەوڵەتەکانی دیکەی جیهان پانکەنەوە. لەبەرئەوە، ئەو دەوڵەتانە لە ڕووی ئابووریی یەوە لاوازدەبن، زۆر جاریش، سەربەخۆیی خۆیان گومدەکەن. هەروەها، بەو پێیەی ئاسایشی خۆراک، بە بەشێ لە ستراتیژی ئاسایشی نەتەوە دادەنرێ، ئەوا تا ڕادەیەکی زۆر، ئەو ئاسایشەش لەدەسدەدەن.
گەر لە بەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییانەی سەرەوەدا، سەرنجێکی باری ئابووریی کوردستان بدەین، وەک کەمێ پێشتر باسمانکرد، دەبینین، کوردستان وەک وولاتێکی دەوڵەمەند، هەموو جۆرە کەرەسەیەکی خاو و پێداویستەکانی ژیانی تێدا چنگدەکەوێ. کەچی هەموو ئەو سەروەت و سامانە گەورەیە، وەک فاکتەرێکی کاریگەری داگیرکردن، دابەشکردن و چەوساندنەوەی نەتەوەیی و چینایەتیی، کارێکی یەکجار مەزنیان، لە باری (نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەلایەتیی و فەرهەنگیی) نەتەوەی کورد کردووە. هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەش وەک زەروو، بە ئارەزووی خۆیان خوێنی دەمژن. نەتەوەی کوردیش، سەرەڕای ئەو هەموو سەروەت و سامانە نەتەوەیی یەی هەیەتی، بە هەژاریی و چەوساوەیی، لە سەر خاکی باووباپیرانی خۆی دەژی.
وەک پرۆفیسۆر « لازەریف »یش دەڵێ: (گەورەترین خەزێنەی زێڕی ڕەش، لە ناوچەی کەنداوی فارس دایە، کە خاکی کوردستان بەشێکی گرتۆتەوە.)«37،9» لە کوردستاندا نەوتێکی زۆر، سەرچاوەیەکی سروشتیی وزە، کەرەسەیەکی خاو و کانزایەکی زۆر هەیە، ئەم سەروەت و سامانە گەورەیە، بڕبڕەی پشت و شادەماری ئابووریی، هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکە پێکدێنێ. لە ڕێگەی ئەو

دەوڵەتانەشەوە، دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی بەرەی خۆراوا، سەروەت و سامانی کوردستان، بە نرخێکی هەرزان کێشدەکەن و کارگەکانیانی پێ بەگەڕدەخەن. چونکە (پیترۆڵ گەورەترین داهاتی سوتەمەنیی کوردستان پێکدێنێ. 8٪ی ئیحتیاتی پیترۆڵی هەموو دنیا ـ بلۆکی سۆسیالیستی پێشووی لێ بترازێ ـ لە کوردستاندا و بە شێوەیەکی سەرەکیی لە کەرکووک و کرماشان و خانەقین و بە شێوەیەکی کەمتر لە سیرت و باتمان دایە.)«54،7» واتە: ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان، لە بوون و بەرهەمهێنانی نەوتدا، لەچاو باکوور و خۆراوای کوردستان، بەشی شێریان بەردەکەوێ. بە تایبەتیی لە باشووری وولاتدا، نەوت لە هێندێ ناوچەی دیکە دۆزراوەتەوە، بەڵام تا ئێستە دەر نەهێنراوە. لێرەدا، بە پێویستی دەزانین، هێندێ لەو سەرچاوە گرنگانەی وزە لە کوردستاندا، لە خشتەی ژمارە« 5 » دا پێش چاو خەین.

جگە لەگازی سروشتیی، وەک کەرەسەیەکی سوتەمەنیی لە کوردستاندا بەکاردێنرێ، ناوچەکانی (کەرکووک، تەنگەی بیجار و بەبەقیر لە کرماشان)، بە دەوڵەمەندترین ناوچەی کوردستان دادەنرێن. بۆیە هەمیشە ئەو چوار دەوڵەتە داگیرکەرە، بە دەس و بە دان کوردستانیان گرتووە و بە هیچ شێوەیە ئامادە نین، دەسبەرداری بن. بەڵام ئەز پێموایە، بەرەی ڕۆژاوا، گەر کوردستانێکی ئازاد، سەربەخۆ و یەکگرتوو دروسبێ، ئەوان بە هیچ جۆرێ زیانی لێ ناکەن. چونکە، لە لایەکەوە کەرەسە خاوەکانی کوردستان، ڕاستەوخۆ لە کورد خۆی دەکڕن. لە لایەکی دیکەشەوە، کوردستانی وێرانکراو و دواکەوتوو، وەک بازاڕێکی گەورە و باشی نوێ، بۆ ساغکردنەوەی کەلوپەلەکانیان بەکاردێنن. جگە لەوەی دەبێ، هەر ئەو دەوڵەتە پیشەسازییە سەرمایەدارانەی خۆراوا، کارگە و پیشەسازییە قورسەکان لە کوردستان دامەزرێنن. واتە: نەتەوەی کورد، چەن قازانج لە دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ دەکا، دەوڵەتەکانی خۆراواش، لە ڕووی دەسکەوتی ئابووریی یەوە، دوو هێندە قازانجی لێ دەکەن.

## 3/ کێشـــەی ئاو :

گەر ئەورۆ، کێشەی ئاو، لە ژیانی گەلانی ناوچەکە و جیهاندا، ئەو ڕۆڵ و بایەخـەی فـاکـتـەری نـەوت نەبینێ، ئەوا لە پاشـەڕۆژێکی نزیکدا، هەمان ڕۆڵی گرنگ و بگرە پتریش وازیدەکا.
هێندەی ئاو و سەرچاوەکانی ئاو، لە کوردستانی مەزندا هەن، هێندە لە هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی کوردستاندا نین. بە تایبەتیی باکووری کوردستان، بە هەز دوو ڕووباری (دیجلە و فورات)، کە سەرچاوەکانیان لە چیاکانی کوردستان هەڵدەقوڵێن، هێندەی دیکە کوردستانیان دەوڵەمەندکردووە و ڕازاندۆتەوە. (سامانی ئاوی ساڵانە، بە هەزاران ملیۆن مەتری سێگۆشە دادەنرێ)«79،6» لەبەرئەوە، چ تورکیا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، چ سووریا و عێراق بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، خۆیان بە خاوەن یا بە برابەشی ئەو دوو ڕووبارە دەزانن. بۆیە، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆش، چەندین جار، کێشە و گرفت لە نێوان ئەو سێ دەوڵەتەدا، لە سەر ئاو دروسبووە. بە تایبەتیی ئەورۆ لە تورکیادا، تورکەکان پرۆژەی (GAP)یان هێناوەتە کایەوە، ئەو پرۆژەیە هەڕەشەیەکی گەورە، لە پاشەڕۆژی سووریا و عێراق دەکا.
دوکتۆر « عەبدوڵلا غەفوور »، سەرچاوەکانی ئاوی لە کوردستاندا، بەم شێوەیەی لای خوارەوە دابەشکردووە :
١. ئاوی سەر ڕووی زەویی: وەک ئاوی (ڕووبارەکان و زەریاچەکان). دەتوانین ئاوی ڕووبارەکانی کوردستان، لە خشتەی ژمارە « 6 »دا پیشاندەین. زەریاچەکانیش وەک (وان، ورمێ، زرێبار، تەنگەسوو، موورزەرد، هەپر، ئالمان، مان گشت، بەرم شوور).
٢. ئاوی ژێرزەویی: کوردستان سامانێکی زۆری ئاوی ژێرزەویی هەیە. جا ئەو ئاوانە، یا بە شێوەیەکی سروشتیی هەڵدەقوڵێن، وەک ئاوی (کانیی و سەرچاوەکان.) یا بە شێویەکی میکانیکیی دەردەهێندرێن، وەک (کارێز، ناعور، پەمپی ئاو و بیر).
٣. پرۆژەکانی ئاو: ئەمانیش سێ جۆرن :
ـ عەماراوەکان وەک (دوکان، دەربەندیخان، بێخمە، مهاباد، ئاراس و زێرین چەم).

ـ ئاوبەندەکان وەک (چەغەلوەندی، ئەسەدخان، دز، کارون، کەرخە، ئەڵوەند، گەنجان جم، دەرکەئاسن، جەوادیە و جەراحی.)
ـ پرۆژەکانی ئاودێریی وەک (موسڵ، کەرکوک، سەنگەسەر، دوبز، خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ ـGAP)«80،6 ـ 129»

ئەم سێ گرفتە سەرەکیی و گەورەیەی، لە ناوچەکەدا بە گشتیی و لە کوردستاندا بە تایبەتیی هەن، جگە لە باری سەخت و ئاڵۆزی جیۆپۆلێتیکی کوردستان، کە هەر بەشێکی قولاییەکی ستراتیژیی، بۆ چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکە پێکدەهێنێ، بە شێوەیە لە شێوەکان، زۆر بە زەقی لە کوردستاندا ڕەنگیانداوەتەوە. هەر یەکەشیان بە جیاجیا، هێندێ جاریش هەرسێکیان پێکەوە، لە لایەکەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، هەم کار لە بارودۆخی نێوخۆی کوردستان و هەر چوار دەوڵەتەکە دەکەن، هەم کارێکی زۆر لە پێوەندییەکانی نێوان کورد ـ کورد، کورد ـ تورک، کورد ـ فارس، کورد ـ عەرەب، کورد و کەمینەکانی کوردستان دەکەن و هێندەی دیکە، کێشەی نەتەوەیی کوردیان ئاڵۆز و سەختتر کردووە. لە لایەکی دیکەشەوە، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، کار لە یەکدی و پێوەندییەکانی نێوان هەر چوار دەوڵەتەکە، بارودۆخی دەوڵەتەکانی ناوچەکە و جیهان دەکەن، بە تەواویی باری ئارامیی و هێمنیی، بازاڕی دەوڵەتەکانی ئەورووپای سەرمایەداریی دەشڵەقێنن.

بۆیە دەبێ، ئەو گرفتە سەرەکییانەی کوردستان، وەک سەرچاوە و کرۆکی باس و کێشەیەکی گرنگ، بایەخێکی زۆری پێ بدرێ و لێکۆڵینەوەی زۆرتر و تایبەتییان لە سەر بکرێ. چونکە، بناغەی پایە سەرەکییەکانی هەر لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمیی، لە بەر ڕووناکایی ئەو سێ فاکتەرە، جوگرافیای ڕامیاریی و باری جیۆپۆلێتیکی ناوچەکەدا دانەڕێژرێ، هەر لێکۆڵینەوەیەک، بە بارودۆخی نەتەوەی کورد، ڕەوشی کوردستان و چوار دەوڵەتەکە، پێوەندییەکانیان بە دەوڵەتەکانی دەوروبەر و ناوچەکە و جیهانەوە گرێ نەدرێ، ئەوا لێکۆڵینەوەیەکی پوچ و لاواز دەردەچێ.

خشتەی ژمارە « 5 »

سەرچاوە نەوتییەکانی کوردستان « 6، 371 -357 »

| ناوچە | چاڵگە نەوتییەکان | ڕێژەی% نەوتی خاوی ساڵانە بۆ نەوتی کوردستان |
|---|---|---|
| باکوور | سیرت، دیاربەکر، قەرەچوغ، سوێدی، ڕۆمێلان، عەینزالە و باتمان. | 03 |
| ناوەند | بابەگوڕگوڕ، بای حەسەن، زەنبوور، نەوتخانە و شیوەشۆک. | 45 |
| باشوور | ئاغاجاری، پازنان، گەچساران، لالی، ماموتین، مەسجیدی سلێمان، نەوتی سەفید، نەوتی شاه و هەفت کل. | 49 |

خشتەی ژمارە « 6 »

ڕووبارەکانی کوردستان بەپێی ڕێژگەکانیان « 129-80،6 »

| ڕێژگە | ڕووبار | لقەکانی |
|---|---|---|
| حەوزی کەنداوی فارس | فورات | (ڕووباری قەرەسوو) چەمی باشی، ئاوی ئۆمەرتەپە. (ڕووباری موورات) دەرەی شێخ برایم، دەرەی گەلوتان، دەرەی قەرەکایە، چەمی قۆپکیران، چەمی چۆما، چەمی شەییار، دەرەی باشمە، ئاوی حەسەناوا و چەمی گەن. |
| | دیجلە | چەمەکانی (بەرکیلین، ئەمبار، قورو، پامبوخ، باتمان، کاررزان، بۆتان، قزل، چاغلان) دەرەی قاواجیک، دەرەی ئینلی، ئاوی نەزیل، ڕووباری خابور، زێی گەورە، زێی گچکە، ئاوی سیروان و ڕووباری عوزێم. |
| کەنداوی ئەسکەندەروون | جەیحان | چەمەکانی(سوغوتلی، گوکسون و ئاقاسوو. |
| | عەفرین | ئاوی سابوونە ... تاد |
| زەریای خەزەر | ئاراس | چەمەکانی (ئاریا، ئاق، قوتور)، دەرەی ئاساغ، زنگمار. |
| زەریاچەکان | وان | چەمەکانی(دەلی، یەنیکۆپرو، مەرمیت، بەندماها) ئاوی گوزال. |
| | ورمێ | چەغەتوو، خوڕخوڕە، کوڕەقەلا، چەمی سەقز(چەمی خان و چەمی ئالتون)، تەتەهوو. |

## دووەم. کێشەی کورد و زلهێزەکانی جیهان :

بەرنامەی زلهێزەکانی بەرەی ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵات، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، لە قازانجی بزووتنەوەی کوردایەتیدا نەبووە. بەڵام دوای ئەوەی، گۆڕانکارییە گەورە و گرانەکانی جیهان ڕوویاندا، دوای ئەوەی جەنگی سارد، لە نێوان هەر دوو کەمپی سەرمایەداریی و سۆسیالیستیدا، کۆتاییپێهات، دوای ئەوەی ململانێ ئایدۆلۆژییەکە، بە سەرکەوتنی بەرەی کەپیتالیزم و تێکشکاندنی بەرەی سۆسیالیزم تەواوبوو، ئیدی لەو ڕۆژەوە، بە تەواویی گۆڕەپانە نێودەوڵەتییەکە، بۆ ئەمێریکا بە تایبەتیی و بەرەی ڕۆژاوا بە گشتیی چۆڵبووە.
گەر چی ئەمێریکا بە ڕواڵەت، باسی مافی مرۆڤ و پرینسیپەکانی دیموکراسیی دەکا، بەڵام هەموو ئەو بیروباوەڕانە، لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆی و هاوپەیمانەکانیدا، بە ئاسانترین شێوە پێشێلدەکا. چاو لە هەموو جۆرە، چەوساندنەوەیەکی نەتەوەیی گەلانی جیهان دەپۆشێ، بڕوبیانو بۆ زۆرداریی و دەسدرێژێکانی، دەوڵەتێکی هاوپەیمانی وەک تورکیا دەدۆزێتەوە.
گەر جاران ئەمێریکاییەکان، بە پلەی یەکەم، لە ڕوانگەی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی شانشینی ئێرانی هاوپەیمانیانەوە، لە کێشەی کورد و شۆڕشی (11/سێپتێمبەری/1961)یان دەڕوانی، ئەوا دوای شۆڕشی ساڵی (1979)ی گەلانی ئێران و دامەزراندنی کۆماری ئیسلامیی، ئەو دۆستە دێرینەیان لە ناوچەکەدا لەدەسدا. هەر چەندە، شتێکی ئەوتۆ لەو شانۆگەرییەی جارانیان نەگۆڕاوە، چونکە ئێستەش، هەر لە درزی بەرژەوەندییەکانی تورکیاوە، لە کێشەی کورد و هەر دوو شۆڕشی باکوور و باشووری کوردستان دەڕوانن.
دیارە ئەو گەلە بندەسەی، بە تەمای دەوڵەتێکی سەرمایەداری ئیمپریالیزمی وەک ئەمێریکا بێ، ڕزگاریکا و دەوڵەتی ناسیۆنالی سەربەخۆی بۆ دامەزرێنێ، تا ماوە دەبێ، خەو بە ئازادیی و سەربەخۆیی یەوە ببینێ و هەر بەو ئاواتەشەوە سەربنێتەوە. چونکە، لە مێژووی جوڵانەوەی نەتەوەیی ڕزگاریخوازانەی گەلانی بندەسی جیهاندا، تەنانەت تاکە یەک نموونە بەدی ناکرێ، ئەمێریکا یارمەتیی

گەلێکی بندەسی دابێ، تا خۆی ڕزگارکا و دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆی خۆی دامەزرێنێ. بەڵکوو بە پێچەوانەوە، هەمیشە دژی بزووتنەوە نەتەوەیی و شۆڕشگێڕەکانی گەلانی جیهان ڕاوەستاوە، بە خراپترین شێوە، هەوڵی دامرکاندنەوە و لەنێوبردنی داوە.
لەو بوارەدا، نەتەوەی کورد، چەن تاقیکردنەوەیەکی تفتوتاڵی، لەگەڵ ئەمێریکا بە تایبەتیی و بەرەی خۆراوادا بە گشتیی هەیە. وەک ئەوەی دوای جەنگی یەکەمی جیهان، کوردستانیان بۆ جاری دووەم دابەشکرد، بناغەی چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەیان دامەزراند و بە هەموویان پتەویانکرد. لە باکووری کوردستان، دژی هەموو ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی (شێخ سەعیدی پیران، ئاراڕات و دەرسیم) ڕاوەستان، بۆ لەنێوبردنی ئەو ڕاپەڕینانە، یارمەتییەکی زۆری تورکەکانیان دا. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، درێغیان لە تێکدان و ڕووخاندنی کۆمارە ساواکەی کورددا نەکردووە. لە باشووری کوردستان، دژایەتی زنجیرە شۆڕشەکانی (شێخ مەحموود و بارزان)یان کردووە. لە هەموو نموونەکانی دیکەش زەقتر و نزیکتر ئەوەیە، ئەمێریکا ڕۆڵێکی مەزنی لە تێکشکان و هەرەسپێهێنانی شۆڕشی (11/ سێپتێمبەر)دا گێڕاوە. هەروەها ئەوڕۆ، هەڵوێستیان بەرانبەر شۆڕشی (P.K.K.) لە باکووری کوردستان، لە هەموو ڕۆژێ خراپترە.
لێرەدا دەتوانین، دوو نموونە لە سەر هەڵوێست و بەرژەوەندییەکانی ئەمێریکا لە ناوچەکەدا بێنینەوە. کاتێ لەشکری ئێران، سنووری نێودەوڵەتیی نێوان ئێران ـ عێراقی بەزاند و لە شارۆچکەی کۆیە، لە بنکەکانی (حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران)ی دا، ئەمێریکا بە توندترین شێوە نارەزایی خۆی دەربڕی. ئەو هاوار و نارەزاییەی ئەمێریکا، لە بەر خاتری چاوی کاڵی، حیزبی دێمۆکرات و گەلی ڕۆژهەڵاتی کوردستان نەبوو، بەڵکوو، تەنیا دژی فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی ئێران بوو، چونکە، پەرەسەندنی دەسەڵاتی ئێرانییەکان لە ناوچەکەدا، هەڕەشەیەکی گەورە لە بەرژەوەندییەکانیان دەکا. بەڵام، تا ئێستە چەندین جار، سوپای تورکیای هاوپەیمانی ئەمێریکا، بە ئاشکرا و بەبەر چاوی هەموو گەلانی جیهانەوە، سنووری نێودەوڵەتیی نێوان تورکیا ـ عێراقیان بڕیوە، بە دڕندانەترین شێوە، پەلاماری

کوردستانیان داوە، خاکی باشووری کوردستانیان، بە بۆمبای ناپاڵم و ڕاکێت کێڵاوە، بە دەیان پیر، مناڵ و ژنیان کوشتووە، تەڕ و وشکیان پێکەوە سوتاندووە، هێندێ لە گوندە ئاوەدانکراوەکانیشیان، لەگەڵ زەویدا تەختکردووە، کەچی کاربەدەسانی ئەمێریکای قەڵای ئازادیی، دێمۆکراسیی و مافی مرۆڤ، تەنیا لە بەر ڕای گشتیی، لە بەر خۆیانەوە سرتە و بۆڵەیەکیان لێهاتووە، ئەگینا زۆر بایەخیان بەو کارە چەپەڵ و دڕندانەیەی تورکەکان نەداوە. لە هەمان کاتیشدا، ئەو مافەیان بە تورکیای داردەسیان ڕەوابینیوە، لە ژێر چارشێوی قەلاچۆکردنی کاری تیرۆریستیدا، گریلاکانی (.P.K.K) لەنێوبەرن و داکۆکیی لە ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتی تورک بکەن!

کاتێ عێراق کوێتی داگیرکرد، ئەمێریکا گەلەکۆمەکییەکی نێودەوڵەتیی سازکرد و بە هەموویان پەلاماری عێراقیان دا. بەڵام، کاتێ سەددام پەلاماری خوارووی عێراق و کوردستانی دا، لە ئاستی ئەو دوو کارەساتە مەزنەی، بە سەر شیعەکان و گەلی باشووری کوردستاندا هات، هیچیان نەکرد و بێدەنگبوون، تا سەددام هەموو ناوچەکانی خوارووی عێراق و کوردستانیشی گرتەوە.

ئەم چەن نموونەیە، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ، لای ئەمێریکا شتێ نییە، ناوی مافی مرۆڤ، کێشەی کورد و پرینسیپەکانی دێمۆکراسیی بێ، بەڵکوو تەنیا، بەرژەوەندیی خۆی و تورکیای وابەستەی لەبەرچاو دەگرێ. لەبەرئەوە، کاربەدەسانی ئەمێریکا، مافی گەلانی بندەس، بە قوربانی یەکێ لە چاڵگە نەوتەکانی کەنداوی فارس دەکەن.

وەنەبێ، لە ئاستی ئەم کەڵەگایی و کۆنترۆڵکردنەی جیهاندا، دەوڵەتەکانی جیهان لە ئەمێریکا بێدەنگ بووبن. ئەوڕۆ خەریکە وردەوردە، جەنگی سارد لە سەر ئاستی جیهان، جارێکی دیکە زیندوودەبێتەوە و نیشانەکانی دەردەکەون. چونکە، چ « چینی میللی » وەک زلهێزێکی ئەتۆمیی و دەوڵەتێکی خاوەن توانای مرۆیی، سەربازیی و ئابووریی، چ « ژاپۆن » وەک زەبەلاحێکی پیشەسازیی، چ « ڕووسیای فیدراڵ »، وەک دەوڵەتێکی مەزن، ئەتۆمیی و دەوڵەمەند، بە فراوانبوونی دەسەڵاتی بلۆکی « NATO » بەرەو ڕۆژهەڵات و دەسەڵاتی یەک لایەنەی زلهێزێکی وەک ئەمێریکا لە جیهاندا، ڕازی

نابن. ئەوە جگە لەوەی، بارودۆخەکە بە تەواویی گۆڕاوە، وەک جاران، مەترسیی شالاو و تەنینەوەی کۆمۆنیزم، لە سەر دەوڵەتەکانی ئەورووپا نەماوە. بۆیە ئەورووپایی یەکانیش نایانەوێ، ئەمێریکا وەک زلهێزێکی جیهانیی، دەس بە سەر بازاڕەکانیان و سەرچاوەکانی وزە لە جیهاندا بگرێ و کۆنترۆڵیانکا، هیچ لایەکیان بە دەسەڵاتی یەک بلۆکی قایل نابن. لەبەرئەوە دەوڵەتەکانی ئەورووپا، هەر لە کۆنەوە هەوڵیانداوە، خۆیان لە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی ئەمێریکا ڕزگارکەن، بەرنامەیەکی ئابووریی سەربەخۆ و پێشکەوتوو پیادەکەن، پارێزگاریی نرخی پارەکانیان لەبەردەم نرخی دۆلاری ئەمێریکاییدا بکەن. ئەوڕۆ هێزی ئەورووپا، بەرانبەر هەڕەشە و مەترسێکانی ئەمێریکا، خۆی لە یەکێتی دەوڵەتەکانی ئەورووپادا دەبینێ.

هەرچەندە، لە کۆندا ڕووسیای تساریی و پاشانیش یەکێتی سۆڤیەت، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، گەلێ جار، زیانی گەورەیان بە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی نەتەوەی کورد گەیاندووە. بەڵام ئەوڕۆ، ڕووسیای فیدراڵ، لە لایەکەوە وەک دراوسێیەکی کوردستان، لە لایەکی دیکەشەوە، هەم وەک دوژمنێکی کلاسیکیی تورک، هەم وەک ئەوەی تورکەکان، خۆیان بە ڕێبەری هەمو گەلانی تورکزمانی جیهان دەزانن، بە تایبەتیی لە نێو گەلانی تورکزمانی، کۆمارەکانی نێو چوارچێوەی سۆڤیەتی کۆنی وەک (ئوزبێکستان، کازاخستان، تورکمینستان، کیرگیزستان و ئازربایجان)دا دەیانەوێ، بە تەواویی جێ پێی خۆیان بکەنەوە و ئیمپراتۆریایەکی پانوپۆڕی تورکی دامەزرێنن. ڕووسەکان لە ئاستی ئەو هەوڵوتەقەلایانەی تورکدا، بە تەواویی نیگەرانبوون، زۆر بە وردیی، سەرنج لە کردار و ڕەفتارەکانی تورکیا دەدەن. جگە لەوەی ڕووسیا دەیەوێ، هێندێ لە ڕاکێتە ستراتیژییەکانی خۆی، بە دەوڵەتی « قوبرس » بفرۆشێ، بەڵام تورکەکان بە هەموو شێوەیە دژایەتیی دەکەن. بە کورتییەکەی، کۆمەڵێ گرفت و ناکۆکیی لە نێوان ڕووسەکان و تورکەکاندا هەیە. نەتەوەی کورد دەتوانێ، کەڵکیان لێ وەرگرێ.

ئەز پێمـوایە، لە داهاتوویەکی نزیکدا، ڕووسەکان لە پێناوی بەرژەوەندیی خۆیاندا، لایە بە لای کێشەی کورددا دەکەنەوە، هەوڵدەدەن، بەربەستێکی جوگرافیایی و مرۆیی، لە لایەکەوە لە نێوان

خۆیان و تورکیادا، لە لایەکی دیکەشەوە، لە نێوان تورکیا و گەلانی قەفقاز و ناوەڕاستی ئاسیادا دروسکەن، ئەو دیوار و بەربەستەش، هەر بە دامەزراندنی هەردوو دەوڵەتی سەربەخۆی ئەرمەنستان و کوردستان دروسدەبێ. بە تایبەتیی لە مانگی (ئۆکتۆبەر و نۆڤەمبەری/1997)دا، ڕووسەکان دوو جار لە کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی جیۆپۆلێتیکی ڕووسیادا، بە ئاشکرا باسی کێشەی نەتەوەیی، سی میلیۆن کوردی بێ دەوڵەت، خاکی کوردستان و شۆڕشە بەرفراوانەکەیان کرد و گوتیان: پێویستە چارەسەرێکی بنەبڕیی، بۆ کێشەی کورد بدۆزرێتەوە.

دەتوانین، باری سەرنجەکانمان، بەم شێوەیە پوختەکەین. ئەوڕۆ لە جیهاندا، سەرەتای دامەزراندنی سێ بلۆکی بەهێزی نوێ بەدیدەکرێ. ئەمێریکا و هاوپەیمانەکانی، چین و ڕووسیا، ئەورووپای یەککگرتوو.

دیارە ئەو بارودۆخە نوێیەی لە جیهاندا، چاوەڕێدەکرێ، بێتەگۆڕێ، کارێکی یەکجار زۆر، لە پێوەندییە ڕامیاریی و دیپلۆماسییەکانی، نێوان هەموو دەوڵەتەکانی جیهان بە گشتیی و دەوڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەند بە تایبەتیی دەکا. دەوڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەند، جارێکی دیکە هێزەکانی خۆیان ڕێکدەخەنەوە، لە بەر ڕووناکایی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیاندا، سەرەداوی پێوەندییەکانیان، بە شێوەیەکی توندوتۆڵتر، بە یەکێ لەو سێ هێزە گەورە جیهانییەوە گرێدەدەنەوە. لە لایەکەوە، لە سەر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی، ململانێیەکی توندوتیژتری خوێناویی، لە نێوان هێزە ئیسلامییەکان و کاربەدەسی دەوڵەتەکاندا سەردەردێنێ. لە لایەکی دیکەشەوە، گرفتەکانی نێوان (عەرەب و ئیسرایل) بە تەواویی دەتەقنەوە.

وا پێدەچێ، لە ناوچەکەدا دوو تەوەر دروسبێ: تەوەرێکیان خۆی لە دەوڵەتەکانی « ئێران، عێراق و سووریا »دا دەنوێنێ. ئەم تەوەرەش، دژی بلۆکی ئەمێریکا، چەن دەوڵەتێکی وەک « چین، ڕووسیا » و هێندێ لە دەوڵەتەکانی یەکێتی ئەورووپای وەک « ئەڵمان و فەڕەنسا » پشگیریان لێ دەکەن. تەوەری دووەمیشیان، زیاتر لە هاوپەیمانێتی نێوان هێزەکانی « تورکیا و ئیسرایل »دا دەردەکەوێ و ئەمێریکاییەکان سەرپەرشتییدەکەن و یارمەتییاندەدەن.

شتێکی ئاشکرایە، گەر ئەم بارودۆخە نوێیە لە ناوچەکەدا بخولقێ، ئەوا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، کار لە بزووتنەوەی کوردایەتیش دەکا. بەڵام، گۆمی ئارامی ناوچەکە و نێودەوڵەتانیش، بە هەر شێوەیە بشڵەقێنرێ، گەر ڕیزەکانی نەتەوەی کورد، وەک ئێستە لەتوپەت و پچڕپچڕبێ، کورد هەلە مێژوویی یەکە لە دەسدەدا، وەک چەندین جاری دیکە لە مێژوودا، لە کیس خۆی داوە. چونکە ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستان، هەر یەکەیان بە گوێرەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان، پێوەندییەکی نابەرابەر و وابەستانەیان، لەگەڵ یەکێ لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا گرێداوە و بە سەر ئەو چوار دەوڵەتەدا دابەشبوون، بیانەوێ و نەیانەوێ، پێ بزانن و نەزانن، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، کار بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکانی ئەوان دەکەن. بۆ نموونە: پارتی کارگەرانی کوردستان، پێوەندییەکی توندوتۆڵی، لەگەڵ «سووریا، عێراق و ئێران»دا هەیە. حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران، هەر چەندە نوزەی لێ بڕاوە و چالاکیی بە تەواویی کزبووە، هەر لە سەرەتای شۆڕشی گەلانی ئێران و دامەزراندنی کۆماری ئیسلامییەوە، لەگەڵ بەعسی عێراقدا بە تەواویی تێکەڵبوون. یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دێمۆکراتی کوردستانی یەکگرتووش، بە هێچ شێوەیە گرێیان لە سەر ناکرێ، چونکە هەر ڕۆژەی بەبەر دەوڵەتێکی داگیرکەرەوەن، بە تایبەتیی پارتی، ئەوڕۆ پێوەندییەکی باشی لەگەڵ «تورکیا و عێراق»دا هەیە و تا ئێستە ناتوانین، لە سەر یەکێ لەو بلۆکانە ساغیکەینەوە.

هەر چی چۆنێبێ، گەر پێشبینییەکان بەو شێوەیە بێ، ناکۆکییەکان لە ناوچەکەدا بتەقنەوە، کورد لە یەک باردا دەتوانێ، کەڵک لەو ئاژاوە نوێیەی ڕۆژهەڵاتی ناوەند و جیهان وەرگرێ، ئەویش ئەوەیە، یەکێتییەکی نەتەوەیی لە هەموو ڕێکخراو و پارتە ڕامیارییەکانی کوردستان پێکبێ، سەرکردایەتییەکی یەکگرتووی ڕامیاریی و سەربازیی هاوبەش دامەزرێ، هەموو پێکەوە بڕیاربدەن و خۆیان بە لایەکدا ساغکەنەوە، ئەگینا گەر هەر پارتەی بە جیا، خۆی بە ڕەوڕەوەی بەرژەوەندییەکانی یەکێ لەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستانەوە ببەسێ، ئەوا گومانی تێدا نییە، جگە لەوەی نەخشە و

ئامانجەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکان جێبەجێدەکەن، هەموو لایەکیشیان بە ژێر دەستوپێوە دەبن و هیچ بە هیچ ناکەن.
لێرەدا پرسیارێ قووتدەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە، گەر ئەو بارودۆخە نوێیە خولقا، ئایا جولانەوەی کورد لە کوردستانی مەزندا، گرێو لە سەر کام بەرەیان بکا و هاریکاریی لەگەڵ کام لایاندا بکا؟ لە وەڵامدا دەڵێم: یەکەم، ئەو بڕیارە لەو کاتەدا دەدرێ، کە ڕووداوەکان لە دایکدەبن. دووەم، بڕیارەکە بۆ سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد بەجێدێڵێن. جا گەر سەرانی کورد هەموو پێکەوە، دەمەتەقێ لە سەر ئەو بارودۆخە نوێیە بکەن، بە تەگبیر و ڕاوێژی ورد، نەخشە و پلانەکانیان داڕێژن، بێگومان دەتوانن، بڕیارێکی یەکگرتووی باش بدەن و چارەسەرێ بۆ کێشەکە بدۆزنەوە. بە پێچەوانەشەوە، گەر ئەو یەکێتیی، تەبایی، دەمەتەقێ و ڕاوێژکردنە، لە نێوانیاندا دروس نەبێ، بەرژەوەندیی بڵندی بزووتنەوەی کوردایەتیی، پێش هەموو جۆرە بەرژەوەندییەکی دیکەی (تاکەکەسیی، بنەماڵەیی، خێڵەکیی، پارتایەتی تەسک و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان)ەوە نەخەن، تەنیا هەوڵ بۆ ئامانجەکانی نەتەوەی کورد نەدەن، ئەوا لە ئێستەوە، هەر پێشنیازێکیش بکەین، هیچ کەڵکی نابێ، چونکە هەر یەکێ لەو ڕێکخراوانە، وەک بەشێ لەو دەوڵەتە داگیرکەرانەیان لێ دێ، وەک ئامرازێ، دژی یەکدی بەکاردێنرێن، لە پێناوی بەدیهێنانی نەخشە و پلانەکانی داگیرکەراندا، ڕۆڵەی کورد بە کوشتدەدەن.
ئەز لەو باوەڕەدام، دەبێ کورد لەگەڵ لایەکدا دەس تێکەڵکا، بەرنامەیەکی باشی بۆ داهاتووی کورد پێ بێ. تا کورد لە بلۆکبەندیی دەوڵەتە داگیرکەرەکان دوورکەوێتەوە و پۆلێتکێکی سەربەخۆ پێڕەوکا، هەم ڕۆڵەی کورد کەمتر بە کوشتدەدا، هەم ڕێزێکیش بۆ خۆی پەیدادەکا. لە جیهانی ڕامیاریی ئەوڕۆشدا، هەموو بڕیاردان و هەڵسوکەوتەکان دەبێ، لە بەر ڕۆشنایی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا بدرێ، ئەگینا ئەوەی پێشەکی لێکدەدرێتەوە و فاکتەرەکانی شیدەکرێتەوە، تەنیا لە خانەی پێشبینیی و پێشنیازدا، جێگەیاندەبێتەوە.

## سێیەم. گرفتەکانی نێوخۆی کورد ـ کورد :

وەنەبێ، تەنیا بارودۆخی نەتەوەی کورد، لە پارچە جیاجیاکانی کوردستان و پێوەندیی لەگەڵ نەتەوە دراوسێکانیدا، هەر بەو شێوەیە خراپبێ، بەڵکوو لە نێوخۆشدا، لەوە باشتر نەبووە و نییە. بە تایبەتیی ئەورۆ، لە هەموو کاتێ خراپتر، ئاڵۆزتر و دژوارتر دەردەکەوێ.
دەتوانین، بە ڕاشکاویی بڵێین: لە سەرتاسەری کوردستاندا، یەکێتی نەتەوەیی ڕیزەکانی کورد، بە تەواویی لێکترازاوە. بە هەموو شێوەیە، بەرژەوەندیی بالای نەتەوەکە، ژێر پێ نراوە. بەرژەوەندیی (تاکەکەسیی، بنەماڵەیی، خێڵەکیی و پارتایەتی تەسک)، پێش هەموو جۆرە بەرژەوەندییەکی دیکەوە خراوە. هەرگیز ڕیزەکانی جەماوەری کورد، هێندە لێکدابڕاو و پچڕپچڕ نەبووە. بۆیە، گەر لە مێژووی کۆنماندا، لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواریدا، وەک کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگیی ـ نیمچە دەرەبەگیی، (ناکۆکیی، ناتەبایی و ڕەفتاری خێڵەکیی)، لە نێوان تیرە و هۆز و میرنشینە کوردییەکاندا باوبووبێ، ئەوا ئەورۆ، لەبەرئەوەی بناغە سەرەکییەکانی سترکتوری کۆمەڵگەی کوردەواریی، تا ئێستەش نەگۆڕاون، هەمان ناکۆکیی، ناتەبایی و خەسڵەتی دواکەوتووی خێڵەکیی، لە دید و بۆچوون و هەڵسوکەوتی ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستاندا دەردەکەون، بگرە بە شێوەیەکی خراپتریش خۆیان دەنوێنن.
کۆمەڵگەی کوردەواریی، وەک کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووی کشتوکاڵیی و گوندیی، بە بەراوردکردن لەگەڵ کۆمەڵگەی گەلانی ناوچەکەدا، لە ماوەی ئەم سەد ساڵەی دواییدا، پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بە خۆیەوە نەدیوە. دیارە ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستانیش، ڕۆڵەیەکی بە ئەمەکی هەمان کۆمەڵگەن، بۆیە بەو شێوەیە، ڕیزەکانی گەلیان لە پارچە جیاجیاکانی کوردستاندا، دابەشدابەش و کوتکوت کردووە.
ئەورۆ، لە لایەکەوە جەنگێکی نێوخۆیی سەخت، لە نێوان ڕێکخراوەکانی یەک پارچەدا تاویسەندووە. لە لایەکی دیکەشەوە، جەنگەکە سنووری پارچەیەکی بڕیوە و لە نێوان ڕێکخراوە جۆربەجۆرەکانی دوو پارچە یا زیاتردا گەرمبووە. هۆکەشی پتر، بۆ

بیروباوەڕ و هۆشی گەندەڵی خێڵەکیی و شێوازی خەباتی چەکداریی دەگەڕێتەوە. با لێرەدا هەڵوێستەیەک بکەین و بزانین، ئایا ئەو خەباتەی بە دەیان ساڵە نەتەوەی کورد، لە کوردستانی مەزندا، لە پێناوی مافە ڕەواکانیدا دەیکا، تا چەن ڕاسبووە؟!!
گەر تەماشایەکی مێژووی شۆڕشەکانی گەلانی جیهان کەین، تاقیکردنەوە مەزنەکانیان پێش چاوی خۆمان خەین، دەبینین، هیچ شۆڕشێ لە جیهاندا، نە هێندەی شۆڕشەکانی کورد خوێن و قوربانیی ویستووە، نە هێندە درێژخایەن بووە و نە هیچ شۆڕشێکیش وەک شۆڕشەکانی کورد، بە دەیان هەرەس و تێکشانی بە خۆیەوە دیوە.
کورد ئەوەتەی هەیە، دەچەوسێنرێتەوە، خاکەکەی داگیر و دابەش دەکرێ، لەبەرئەوە بە شێوەیەکی بەردەوام، لە هەوڵی سەربەخۆیی و ئازادیدا بووە، یەک لە دوای یەک ڕاپەڕینی بەرپاکردووە، چەندین شۆڕشی خوێناویی هەڵگیرساندووە و تا ئەوڕۆش بە شێوەیەکی بەردەوام، هەر خەباتدەکا، خوێندەڕێژێ، لاشەدەنێژێ، قوربانییدەدا، بەڵام هیچ ئاکامێکی نەبووە و تا ئایندەیەکی نادیاریش، هیچ تروسکاییەکی تێدا بەدی ناکرێ، چونکە شێوەی پەروەردەکردن و خەباتەکەی هەڵەبووە و ئێستەش هەر هەڵەیە.
هەموو ڕێکخراوێکی ڕامیاریی، شۆڕشێکی چەکداریی، هەموو گەلێکی بندەسی ئەم سەر ڕووی زەوییە، بەرنامە و ستراتیژێکی دیاریکراوی نەتەوەیی خۆی هەبووە و هەیە. بەڵام، تەنیا ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستان و شۆڕشەکەیی و نەتەوەی کورد، بێ بەرنامە و ستراتیژ، دەشتی کاکیبەکاکیی خەباتیان کێڵاوە و ئێستەش هەر دەیکێڵن و خڕکەبەرد، لە گومبەزی داگیرکەران دەگرن.
دیارە، ئامانج و دینگە سەرەکییەکانی، ستراتیژی هەموو نەتەوەیەکی بندەس، پتر خۆی لە ئازادیی و ژیاندنەوەی گەل، یەکێتی نەتەوەیی، سەربەخۆیی خاک و دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی ناسیۆنالدا دەنوێنێ. بەڵام، هێندێ بزووتنەوەی نارەسەن هەن، تەنیا بڕوایان بە چارەسەری کاتیی هەیە، ئامانجەکانی خۆیان، لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتە تێریتۆریالانەدا، بە هێندێ مافی دیمۆکراسیی و فەرهەنگییەوە دەبەسنەوە. یا داوای هێندێ مافی ڕامیاریی بۆ گەلەکانیان دەکەن،

وەک ئەوەی هەر یەکێ لە ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستان، لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستاندا، داوای مافی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی بۆ کوردستان دەکەن.
بێگومان، لێرەدا نامەوێ، دەمەتەقێ لە سەر ئەوە بکەم، ئایا ئەو داواکارییانە تا چەن ڕاستن؟ چونکە ئەوە بەرنامەی تایبەتیی ئەو ڕێکخراوانەیە و پێوەندیشی هەر بە خۆیانەوە هەیە. دووریش نییە، ئەوان لەوە زیاتریان پێ هەڵسوڕێ!!! بەڵام، ئەوەی لێرەدا پێویستە، بە وردیی سەرنجی لێ بدەین و هەموو لایەنەکانی شیکەینەوە، ئەوەیە، ئایا جگە لە شۆڕشێکی سەرانسەریی، داوای سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانیی یەکگرتوو، ئەو مافە ناناوەندییانە ئەوە دێن، ماوەی هەشتا ساڵ، لە دوای یەکەم جەنگی جیهانەوە، ئەو هەموو خوێنەی لە پێناودا بڕێژرێ؟ ئەو هەموو قوربانییەی بۆ بدرێ؟ ئایا ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی، پێویستی بە شۆڕشی چەکداریی هەیە، یا پتر بە (خەباتێکی ڕامیاریی، دێمۆکراسیی، دیالۆگی دوو لایەنە و چەن لایەنە و دیپلۆماسییەتێکی نەرمونیان) بەدەسدێنرێ؟! ئەز پێموایە، ئەو مافە دێمۆکراسییانە ئەوە ناهێنن، یەک دڵۆپ خوێنیان لە پێناودا بڕێژرێ و پێویستیان بە خەباتی چەکداریی، خوێنڕشتن، کوشتن و بڕین نییە. دەتوانین هۆکانیشی لە چەن خاڵێکدا ڕوونکەینەوە:
1. (جگە لە مافی سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنال، هەر چی مافە نەتەوەیی یەکانی دیکە هەیە، هەر لە ناناوەندیی ئیدارییەوە، تا بە ئۆتۆنۆمیی و فیدراڵیش دەگا، هەر هەموویان داگیرکەرانی گەلان و کۆلۆنیالیزمی جیهان دایانناوە، تا نەتەوە ژێردەسەکان، بیر لە چارەسەری بنەڕەتیی و سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەت نەکەنەوە.)«85،4»
2. تاقیکردنەوە سەرکەوتووەکانی، خەباتی گەلانی جیهان دەریانخستووە، شۆڕشی چەکداریی، تەنیا بۆ مافی چارەنووس، ڕزگاریی، سەربەخۆیی نەتەوەیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنال بەرپادەکرێ، بۆ بەدەسهێنانی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی، کەس بە دەسی خۆی ماڵی خۆی وێران ناکا. لەم بوارەشدا شۆڕشی گەلانی (جەزایر،

ڤێتنام، کەمبۆدیا، لاوس، ئەنگۆلا، مۆزەنبیق و ئەرتیریا ... تاد)، بەڵگەی زیندووی بۆچوونەکانمان بەدەسەوەدەدەن. تەنیا یەک گەلی بندەس، لەم جیهانەدا بەدی ناکرێ، شۆڕشی چەکداریی، بۆ ئەو مافە نێوناچلانە بەرپاکردبێ.

3. سیستێمی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی، تا ڕادەیەکی زۆر، تەنیاوتەنیا، لە نێو ئەو دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانانەدا سەرکەوتووبووە، کە لە ڕووی شارستانییەوە پێشکەوتوو، لە ڕووی ئابوورییەوە بە توانا، لە ڕووی بیروباوەڕی مرۆپەروەرییەوە دادپەروەر و لە ڕووی سیستێمی فەرمانڕەواییەوە دێمۆکراسیی بوون. ئەگینا لە هەموو ئەو دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانانەی، لە ڕووەکانی(شارستانیی، ئابووریی، مرۆدۆستیی و فەرمانڕەوایی)یەوە، دواکەوتوو، لاواز، شۆڤێنیی، بەرچاوتەنگ و دیکتاتۆریی بوون، تەنانەت گەر چەندین ساڵیش، پێکەوە لە ژێر ئالای یەک دەوڵەتی تێریتۆریالدا ژیابن، لە ئەنجامدا ئەو تاقیکردنەوانە، هەر سەرکەوتوو نەبوون و هەرەسیانهێناوە. ئەوە ئەزموونەکانی سیستێمی فیدراڵیی، لە کۆمارە سۆسیالیستەکانی پێشووی(یەکێتی سۆڤیەت، چیکۆسلۆڤاکیا، یۆگۆسلاڤیا، پاکستان، گیرگرفتی چیچێن لە ڕووسیای فیدراڵ، کێشەی کۆپیک لە کەنەدا و ناکۆکیی نێوان فالۆن و فلامۆنەکان لە بەلچیکا ... هتد)، کە هێندێ لەو دەوڵەتە تێریتۆریالانە هەڵوەشانەوە و لە جێگەیان چەن دەوڵەتێکی ناسیۆنال دامەزران.

4. سیستێمی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی، پتر بۆ ئەو دەوڵەتە ناسیۆنالانە دەسدەدا، کە بە ڕووبەری خاک گەورەن و بە ژمارەی دانیشتووان زۆرن، تا شێوە فەرمانڕەوایی یەکی ناناوەندیی، بۆ ئاسانکردن و ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی دانیشتووانی، ئەو دەوڵەتانە دابینکەن. وەک (وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکا، ئەڵمانیای فیدراڵ ... تاد).

5. گەر خەباتی چەکداریی، لە پێناوی هێندێ مافی وەک ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیدا بکرێ، ئەوا جگە لەوەی، خەڵکێکی زۆر تووشی ئازار، ئەشکەنجە، گرتن، ڕاونان، کوشتنوبڕین دەبن، لە هەمان کاتیشدا، سەراپای وولاتەکە وێراندەبێ و هیچ سەرەنجامێکی باشیشی نابێ. هەروەها، بۆ سەربەخۆیی تەواویش، هەر هەمان قوربانییدەدرێ. وەک

ئەوەی چەندین ساڵە کورد، لە کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشووردا ئەو خەباتەدەکا، یا موسوڵمانەکانی « فیلیپین » هەوڵی بۆ دەدەن، یا گەلی « خوارووی سۆدان » قوربانی لە پێناودا دەدەن.

6. لەبەرئەوەی، لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا، تەنیا هەر دوو گەلی باڵادەس و کوردی تێدا ناژی، بەڵکوو لە چەن گەل و کەمینەیەکی نەتەوەیی دیکەی وەک (ئەرمەن، ئازەر، بلوژ و ... تاد)یش پێکهاتوون، داگیرکەرانی کوردستان بە هێچ شێوەیە ناتوانن و نایانەوێ، لە هیچ پارچەیەکی کوردستاندا، تەنیا بۆ کورد، دان بە مافی ئۆتۆنۆمیی – فیدراڵیدا بنێن. چونکە، ئەو دەوڵەتانە دەبێ، لە بنەڕەتدا وەک چەن دەوڵەتێکی دێموکراسیی خۆیان بنوێنن، سیستێمی فەرمانڕەواییان، لە بەر ڕۆشنایی سیستێمی ئۆتۆنۆمیی – فیدراڵیدا دابڕێژن، سەراپای وولاتەکە بە سەر چەن ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمیی – فیدراڵیدا دابەشکەن، دان بە مافی هەموو گەلان و کەمینە نەتەوەیی یەکانی دیکەی، نێو چوارچێوەی سنووری دەوڵەتەکانیاندا بنێن، واتە: مافی ئۆتۆنۆمیی – فیدراڵیش، بەو گەلانە بدەن، ئەو کاتە لە هەر پارچەیەکدا، کورد دەتوانێ، بە مافی ئۆتۆنۆمیی – فیدراڵیی بگا. ئەگینا گەر، سەراپای دەوڵەتەکە، لە سەر بنچینەی سیستێمی ئۆتۆنۆمیی – فیدراڵیی دا نەمەزرێ، هەرگیز نەبووە و نەکراوە، دەوڵەتێ بەشێکی ئۆتۆنۆمیی – فیدراڵیی بێ و بەشەکانی دیکەشی، جۆرە سیستێمێکی دیکەی تێدا پێڕەوکرێ. یا دەبێ، وولاتەکە هەمووی ئۆتۆنۆمیی – فیدراڵیی بێ، یا ئەو سیستێمە بەو شێویە ناچەسپێ. یا دەبێ، هەمو گەلان و کەمینە نەتەوەیی یەکان، بە مافە ڕەواکانی خۆیان بگەن، یا ئەوەتا هەموویان پێکەوە، لە لایەن دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە، وەک یەک دەچەوسێنرێنەوە. لەم بوارەدا تاکە نموونەیەک، لە هەموو جیهاندا بەدی ناکرێ، دەوڵەتێ بەشێکی ئۆتۆنۆمیی – فیدراڵیی بێ و بەشەکەی دیکەی، شێوە فەرمانڕەواییەکی دیکە بێ.

بۆ نموونە: لە « ئیسپانیا » تەنیا « باسک »ەکان مافی ئۆتۆنۆمییان نییە، بەڵکوو هەموو دەوڵەتەکە لە چەن ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمیی پێکهاتووە. هەروەها، دەوڵەتێکی وەک « سویسرا »، کە لە سێ گرووپی ئێتنیی سەرەکی پێکهاتووە، بە سێ زمانی سەرەکیی « ئەڵمانیی،

فرەنسیی و ئیتالیی » دەپەیڤن، لە چەن ناوچەیەکی فیدرالّیی جیاواز دروسبووە، نەک یەکێ لەو گروپە ئیتنیانە، مافی فیدرالّیی بەدەسهێنابێ و گروپەکانی دیکەش، لە مافەکانی خۆیان بێبەشبووبن. واتە: لە بنەڕەتدا دەولّەتەکە، لە سەر بنچینەی سیستێمی فیدرالّیزم دامەزراوە.

لەبەرئەوە، دروشمی ئۆتۆنۆمیی لە ڕۆژهەلاّتی کوردستاندا، دروشمی فیدرالّی لە باشووری کوردستاندا، جگە لەوەی بە هەلّەیەکی مێژوویی دادەنرێ، بە هیچ شێویەکیش بەدی نایە، تا هەر دوو دەولّەتی ئێران و عێراق، لە سەر بناغەی سیستێمێکی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدرالّیی دا نەمەزرێ، مافی هەموو گەلەکانی دیکەش دابین نەکرێ.

بۆیە سەرانی کورد، پێش ئەوەی داوای ئەو مافانە بکەن و دروشمەکانیان بەرزکەنەوە، پێشەکیی دەبێ، لەگەلّ ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی، ئەو گەل و کەمینە نەتەوەیی یانەدا، سەرەتای دیالۆگێکی کراوە و پێشکەوتووخوازانە دامەزرێنن، لە سەر مافەکانی خۆیان ڕێککەون، داواکارییەکانیان یەکخەن، ئەو کاتە، داوای دامەزراندنی دەولّەتێکی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدرالّیی بکەن، ئەگینا بەو شێوەیە نەبێ، نە کورد بە مافی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدرالّیی دەگا، نە کاربەدەسانی ئەو دەولّەتە داگیرکەرانەش، دان بە مافەکانی گەلانی بندەسیاندا دەنێن. تەنانەت گەر کورد بە مافی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدرالّییش شادبێ، گەلەکانی دیکەی نێو سنووری دەولّەتەکە، لە مافی خۆیان بێبەشکرێن، ئایا ئەو کاتە گەلی کورد، لە هەر پارچەیەکی نیشتمانەکەیدا، هەلّوێستی بەرانبەر مافە نەتەوەیی یەکانی ئەو گەلانە چۆن دەبێ؟ ئایا وەک بەشێ لە دەزگەکانی دەسەلاّتی نێوەندیی، بۆ کپکردنی دەنگی ئازادیخوازانەی گەلەکانی دیکە، حسێبی بۆ ناکرێ؟

ئەوە جگە لەوەی، گەر لە دەولّەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانی وەک (تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا)دا، تەنیا یەک نێوچەی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدرالّیی هەبێ، تەنیا گەلی کورد، بە مافی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدرالّیی گەیشتبێ، گەل و کەمینەکانی دیکە لەو مافانە بێبەشکرابن، ئایا گەرەنتی چییە، کاربەدەسانی ئەو چوار دەولّەتە، لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا، بە سووکە بڕیارێ لەو مافانە پەشیمان نابنەوە؟! بەلاّم گەر

دەوڵەتەکە لە بنەڕەتدا، لە سەر بنچینەی سیستێمی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی دامەزرابێ، هەموو گەل و کەمینە نەتەوەیی یەکانی دیکەش، مافە نەتەوەیی یەکانی خۆیان بەدەسهێنابێ، ئەوا چ لە نێوخۆی ئەو دەوڵەتانە و چ لە بوارەکانی نێودەوڵەتیدا، کەسێتیی و دەسەڵاتێکی دیکەی یاسایی و دەستووریی، بە ناوچە ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵییەکان دەبەخشێ، هێز و توانایەکی تایبەتییان دەبێ، گەرەنتی سەرکەوتن، مانەوە و بەردەوامبوونی پتردەبێ، چونکە هەموو گەل و کەمینەکان، پێکەوە داکۆکیی لەو سیستێمە دەکەن.
7. گریمان، لە ئەنجامی خەباتێکی سەختی چەکداریدا، ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی، لە سەر دەسی یەکێ لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا، بۆ کورد سەلمێنرا. ئایا چ گەرەنتییە هەیە، ئەو ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵییە، تا سەر بەردەوامبێ؟ یا گەر دەستەی فەرمانڕەوایانی ئەو دەوڵەتە گۆڕان، گەرەنتی چییە، ئەوانیش لە سەر هەمان بەرنامەی دەستەی فەرمانڕەوایانی پێشووی خۆیان بەڕێوەدەچن؟ یا گەر ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵییەکەش بە تەواویی چەسپا، ئایا دوای ئەوە چی دەبێ؟ ئایا خەون و هیواکانی ئەو گەلە بندەسە، لەوێدا دەوەسێ و کۆتاییدێ؟
8. لە بەر ڕووناکایی بارودۆخی جوگرافیای کوردستانی گەورەدا، هەر شۆڕشێکی چەکداریی لە پارچەیەکی دیاریکراودا، لە پێناوی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیدا، دژی هەر دەوڵەتێکی داگیرکەر بەرپاکرێ، هەموو دەوڵەتە داگیرکەرەکانی دیکە دژی ڕادەوەستن و هەر لە بێشکەدا دەیخنکێنن. چونکە، لەوە دەترسن، گەر شۆڕشەکە سەرکرێ و ئامانجەکانی خۆی بەدیبێنێ، لە لایەکەوە هانی گەل و کەمینە نەتەوەیی یەکانی دیکەی ئەو دەوڵەتانە بدا و ئەوانیش داوای مافەکانی خۆیان بکەن. لە لایەکی دیکەشەوە بۆ بەشەکانی دیکەی کوردستانی بندەسی خۆیان بتەنێتەوە.
9. گەر یەکێ لە دەوڵەتە داگیرکەرەکان، لە پارچەیەکی دیکەی کوردستاندا، یارمەتیی شۆڕشێکی چەکداریی بدا، دیارە ئەو یارمەتییە، بۆ مەبەسێکی تایبەتیی خۆی دەدا. شتێکی ئاشکرایە، پتر دەیەوێ، شۆڕشەکە وەک مقاش، دژی دەوڵەتەکەی بەرانبەری خۆی

بەکاربێنێ. کاتێ ئامانجە گڵاوەکانی خۆشی بەدیهێنا، ئەوا هەر زوو پشتیتێدەکا و دژیشی ڕادەوەستێ. لەم بوارەدا، هێشتا تاقیکردنەوەی چواردە ساڵەی شۆڕشی (11/سێپتیمبەر/1961) هەر تازەیە و هەڵاوی هەرەس و تێکشکانی لێ هەڵدەستێ.

10. لەبەرئەوەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، خاوەنی سوپایەکی بە هێز و گەورە، چەک و تەقەمەنیی و کەرەسەیەکی نوێی جەنگین، چەکێکی زۆری مرۆقرکەری « کیمیاویی، بایۆلۆژیی و بەکتریۆلۆژیی »ان هەیە، چەندین جۆر فڕۆکەی مۆدرێنیان هەیە، سەروەت و سامانێکی باش و توانایەکی « مەتریاڵیی، مرۆیی و ئابووریی »ان هەیە، هەمیشە ئەوان سەرکەوتوو، شۆڕشە چەکدارییەکەی کوردیش ژێرکەوتوودەبێ. چونکە، لە هیچ ڕوویەکەوە، تەرازووی هێزەکان وەک یەک نین، هەمیشە تای تەرازووی دەوڵەتەکە، بە سەر تای تەرازووی شۆڕشەکەدا زاڵە.

11. لەبەرئەوەی گەلی کورد، لە هیچ پارچەیەکی کوردستاندا، توانای ئەوەی نییە، جەنگی پەلاماردان و هێرشبردن بکا، بەڵکوو تەنیا توانای خۆپاراستن و داکۆکیکردنی لە خۆی هەیە، بۆیە هەر ناوچەیەکیش ڕزگارکا، ناتوانێ، وەک پێویست بیپارێزێ، دوژمن هەر زوو لە بندەسی دەردێنێتەوە، تا لە ماوەیەکی کورتدا، داخوازییەکانی خۆی بە سەر دەوڵەتە داگیرکەرەکەدا بسەپێنێ و بە ئامانجەکانی خۆی بگا.

12. لە بەر ئەو بارە جوگرافیانالەبارە، لە بەر نەبوونی کەرەسەی جەنگیی، لەبەرئەوەی کاتێ، کورد لە سنووری ئەو دەوڵەتانەدا، خەباتی چەکداریی دەکا، کاتێ داوای مافی ئۆتۆنۆمیی - فیدراڵیی دەکا، بە هیچ شێوەیە قوڵاییەکی ستراتیژیی نییە، تا بە کاریبێنێ و پاڵی پێوە بدا. هەروەها، لەبەر گەلێ هۆی دیکەی وەک(هەژاریی، برسێتیی، نەخۆشیی، نەبوونی ڕێگای هاتوچۆ بۆ دەرەوە، بێ پشتیووانی ... تاد)، سەرانی شۆڕشەکە ناچاردەکەن، پەنا بۆ دەوڵەتێکی داگیرکەری دیکەی کوردستان بەرن. ئەو دەوڵەتەش، بە ئارەزووی خۆی و لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیدا، چۆنی بوێ، وایان هەڵدەسوڕێنێ.

بۆ نموونە: ڕێکخراوەکانی باشووری کوردستان، پەنا بۆ بەر دەوڵەتی داگیرکەری ئێران دەبەن. بە پێچەوانەشەوە، ڕێکخراوەکانی

ڕۆژهەڵاتی کوردستان، خۆیان بە پێچکەی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی داگیرکەری عێراقەوە دەبەستنەوە. ئەوان، ئەو دوو دەوڵەتە داگیرکەرە، بە قوڵایی ستراتیژیی خۆیان، پاراستنی قەوارەی ڕێکخراوەکان، گەلی باشوور و ڕۆژهەڵات دادەنێن. لە کاتێکدا، ئەم ڕێباز، دید و بۆچوونە، بەپێی هەموو جۆرە لێکدانەوەیەکی(نەتەوەیی، ڕامیاریی و ستراتیژیی)، خۆی لە خۆیدا، بە هەڵەیەکی گەلێ گەورە دادەنرێ. لەبەرئەوە، لە لایەکەوە سەرکردایەتی هەر دوو شۆڕشەکە، سەربەخۆیی ڕامیاریی خۆیان لە دەستدەدەن. کاتێکیش سوکانی ئۆتۆمۆبیلی شۆڕشەکە، بە دەس شۆڤێرە ڕاستەقینەکانی خۆیەوە نەبوو، ئۆتۆمۆبیلەکە لە ڕاستە شەقامی کوردایەتیی لایدا، ئەوە جگە لەوەی شۆڕشەکە، بە هیچ ئامانجێکی خۆی ناگا، بە تەواوییش تێکدەشکێ. لە لایەکی دیکەشەوە، دەوڵەتە داگیرکەرەکانیش، لەو کارەی ئەوان بێدەنگ نابن، بە ناپاک و بەکرێگیراوی ئەو دەوڵەتانەیان دادەنێن. دیارە، بەپێی یاسا و دەستووری ئەو وڵاتە داگیرکەرانە بێ، فەرمانڕەوایانی ئەو دەوڵەتانە ئەو مافەیان هەیە، بە ناپاکیان دابنێن و تۆڵەیان لێ بکەنەوە. چونکە، لە ئەرشیفی هیچ دەوڵەتێکی جیهاندا نەبووە، هاووڵاتیی دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانەکان، لە پێناوی مافەکانی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیدا، هانا بۆ دەوڵەتێکی دیکەی بیانیی بەرن، لە هەموو ڕوویەکەوە، دژی دەوڵەتەکەی خۆیان، یارمەتیی لێ وەرگرن و هەر دوو لایان پێکەوە هاریکارییبکەن.

13. کێشەی داواکردنی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی، خۆی لە خۆیدا، بە کێشەیەکی نێوخۆی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستان دەژمێررێ. بەپێی خاڵەکانی مافی چارەنووسی نەتەوەکان، لە بەر تیشکی دەستووری کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، هیچ دەوڵەتێ بۆی نییە، دەس لە کاروباری نێوخۆی دەوڵەتێکی دیکەوە وەردا. لەبەرئەوە، هەمیشە کێشەکەمان، وەک کێشەیەکی نێوخۆیی ئەو چوار دەوڵەتە داگیرکەرە تەماشادەکرێ. جگە لەوەی، کێشەکەمان نابێ بە کێشەیەکی نێونەتەوەیی، لە هەموو جۆرە پشگیریی و کۆمەکێکی ئینتەرناسیۆنالانەی گەلان و دەوڵەتە مرۆدۆسەکانی جیهانیش بێبەشدەبین و بە تەنیا دەمێنینەوە.

14. بێگومـــان، هـەمــوو ڕۆڵەکـــانی گـــەل، ئەندامـــانی ڕێکخـــراوە ڕامیـاریـیـەکـانی کـوردسـتـان، لە سـەر یـەک بەرنامـەی دیاریکراو و سـتـراتیـژێکی یـەکگرتوو ڕێک ناکـەون. هـەروەها، لە سـەر جـۆری ئەو ئۆتۆنۆمیـی ـ فیـدراڵییـەی داوایدەکەن، چوون یەک نـابن. جگە لەوەی، هێندێ کورد دژایەتی ئەو دروشمانە دەکەن و لەگەڵ سەربەخۆیی تەواو و دامـەزراندنی دەوڵەتێکی کوردسـتـانیـی دەبن. لەبەرئەوە، هەمیشـە ناکۆکییەکی زۆر لە نێوان ڕیزەکانی گەلدا پەیدادەبێ، لە ئەنجامیشدا دووبـەرەکـــیـی دروســــدەبێ. هێندێ جــاریش ئەو نـاکــۆکـــیـی و دووبەرەکییانە، لە لایەن کۆمەڵێکەوە، بە ناپاکیی کۆتاییپێدێ.
بۆ نموونە: ساڵی (1964)، کاتێ گفتـوگـۆی نێوان شـۆڕش و دەوڵەتی عـێراق دەسـیـپـێکرد، نـاکـۆکیی و دووبەرەکـیـیـەک، لە نێـوان ژەنەڕاڵ بارزانیی و پەلیـتـبـیـرۆی پارتیدا ڕوویـدا، کە یەکێ لە هۆیەکـانی ئەو دووبەرەکـیـیـە، بۆ گـفـتـوگـۆ و تێـڕوانیـنی جـیـاوازی نێـوان سـەرۆک بارزانیی و ئەندامـانی پەلیـتـبـیـرۆی پارتی دەگەڕێتـەوە. پاشـانیش، بە ناپاکـیـیـەکی نەتـەوەیی، کـۆتاییـپـێـهـات، تا ئەوڕۆش ئەو ناکـۆکـیی و دووبەرەکیی و ناپاکییە، بە شێوەیە لە شێوەکان، هەر جارەی بە نۆرە، لـە لایەن لایەکـــیـــانـەوە درێـژەی پـێ دەدرێ. هەروەهـا، لـەم بـوارەدا دەتوانین، بـاسی جـەنگی نێـوخـۆی ئەوڕۆی باشووری کـوردسـتـانیش بکەین، کە هـۆ سـەرەکییەکانی بۆ دەسـەڵات، پارە و جیـاوازیی دید و بۆچوونەکان دەگەڕێتەوە.
15. (ئۆتۆنۆمـیی یەکسانیی ڕاسـتـەقـینە، لە نێوان نەتـەوەکـاندا بەدی ناهێنێ. چەوسـاندنەوەی نـەتەوایەتیی لـەنێـو نابا و هـەمـوو برینـەکـان سـاڕێژ ناکـا. مـافـە نەتەوەیی یە سـەرەکـیـیـەکانی وەک سـەروەریی و سـەربەخـۆیی نیـشـتـمـانیی بەدەس ناهێنێ، پێکەوەلکاندن و زیانە زۆرەکانی لەنێو نابا. چارەسـەرێکی نێوەناچڵە و شۆڕشگێڕانە نییە. چارەسـەرێکی بۆرژوایانەی دیمـۆکراسییە، پارێزگاریی بەرژەوەندییە ئابووریی و چینایەتییـەکانی، بەهێـزترین چین لە ڕووی ئابوورییـەوە دەکا، کە دەسی بە سـەر دەسـەڵاتی ڕامیاریی دەوڵەتدا گرتووە، واتە: پارێزگـاریی چەوسـاندنەوەی چینـایەتـی دەکا. گـۆڕانـە کـۆمـەڵایەتیی و چیـنـایەتیـیـە چاوەڕوانـکـراوەکـان بـەدی نـاهێنێ، کـە بۆ ئـاسـانکردنی

خەبات لە پێناوی سەرکەوتنی سۆسیالیزمدا، بۆ هەر دوو نەتەوەکە پێویستن. ڕێ لە یەکگرتنی ئارەزوومەندانەی پێویست دەگرێ، بۆ دامەزراندنی چاکترین پێوەندیی لە نێوان ئەو نەتەوانەی، لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا پێکەوە دەژین. لەگەڵ داخوازیی، پێویستییەکان، ڕەوتی گۆڕان، پێشکەوتنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانە و یەکگرتنەوەی دیموکراسییانەی هەر دوو نەتەوەی برای عەرەب و کورددا ڕێک ناکەوێ ...)(1، 39-40»

بۆیە، ئێستە دەتوانین، بە ڕاشکاویی بڵێین: هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، هەموو ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانەی لە کوردستاندا، لە پێناوی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیدا بەرپابوون، جگە لەوەی هیچ ئاکامێکیان نەبووە و ناشیانبێ، هەڵەیەکی مێژوویی گەورەبوون و بە زیانێکی گەلێ مەزنیش، لە سەر نەتەوەکەمان تەواوبوون.

ئەوە کورتەی ئەو باسەبوو، تا بزانین، بۆچی خەبات و شۆڕشی چەکداریی، لە پێناوی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیدا هەڵەیە و زیانێکی زۆرمان پێ دەگەیەنێ. کەواتە دەبێ، هەموو هەوڵوتەقەلاکانمان، هەر بۆ سەربەخۆیی بێ، چونکە هەر بە سەربەخۆیی، نەتەوەی کورد لە دەس داگیرکردن، چەوساندنەوەی نەتەوەیی، هەموو ئەو کەموکوڕیی و زیانە گەورانەی ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی ڕزگاریدەبێ.

## چوارەم . دەربارەی بارودۆخی ئەوڕۆی کوردستان :

دوای ئەوەی، دەوڵەتی داگیرکەری عێراق، ئەو هەموو ڕاونان، گرتن، کوشتنوبڕینەی، لە کوردستاندا بە ئەنجامگەیاند، دوای ئەوەی، ئەو هەموو دەربەدەریی، کاولکردن، سوتاندنی گوندانە جێبەجێکران، دوای ئەوەی، زۆربەی دانیشتووانی گوند و شارۆچکەکانی کوردستان ڕاگوێزران، دوای ئەوەی، ئەو هەموو ئەنفالە گچکە و گەورانە ڕوویاندا، دوای ئەوەی، هێندێ لە ناوچە جیاوازەکانی وەک « هەڵەبجە، قەرەداغ، بادینان و ... تاد » کیمیابارانکران، بە هەزاران مرۆڤی کورد، بە گازی ژاراویی خنکێندران، بڕوا ناکەم، هیچ « فاڵچییە، جادوگەرێ، سەرکردەیەکی کورد »، ئەوەی بە بیردا هاتبێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان، گەلی باشووری کوردستان، لە کۆڵ جەللادە خوێنمژەکەی خۆی ببێتەوە. بڕوا ناکەم، سەرکردەکانی کورد، پێشبینیی ئەوەیان کردبێ، جارێکی دیکە لە کوردستانەکەی خۆیاندا، پڕ بە سییەکانیان، هەوای سازگاری سەربەستیی هەڵمژن و کوردستانێکی ئازاد و دوور لە دەسی بەعسی فاشییان دەسکەوێتەوە.

بەڵام، وەک دەڵێن: ئەوەی لای بەندە خەیاڵە، لای خوا بەتاڵە! یا ئاشی نەزان، خوا دەیگێڕێ! ئەوە بوو، لە بەهاری(1991)دا، « موعجیزە » گەورەکە ڕوویدا، کورد هەلی تێکشکانی سوپای عێراق و دەزگە سەرکوتکەرە بەعسییەکانی، لە جەنگی دووەمی کەنداودا بۆ هەڵکەوت. جەماوەری گەلەکەمان، بە خاس و خراپییەوە، بە جوان و پیرییەوە، بە نێر و مێیەوە ڕاپەڕین، تا سنووری چیاکانی « حەمرێن »، هێزی دوژمنانی نێوخۆ و سوپای داگیرکەری بەعسی بیانییان ڕاماڵی، کوردستانیان ئازادکرد و وەک هێلکەیەکی پاکراو، لە بەردەمی سەرانی کورد و بەرەی کوردستانی عێراقدا دایاننا.

بەڵام بە داخەوە، هەموو جارێ، لە مێژووی لە خوێنهەڵکێشراوماندا، هەر سەرانی کورد، سەریان لە جەماوەری زیت و وریا تێکداوە. هەموو جارێ، هەر سەرکردەکانی کورد، پێچیان بە داخوازیی و ئامانجەکانی کورد کردۆتەوە، دەنگی جوڵانەوە و ڕاپەڕینەکانیان پێ کپکردوون. بۆیە، جگە لەوەی سەرانی بەرەی کوردستانیی، هەڵە مێژوویی یەکەیان

بە گفتوگۆیەکی زرکی ناوەڕۆک پوت لەباربرد، لە هەمان کاتیشدا، هەر لە سەرەتاوە، لە سەر کورسیی فەرمانڕەوایی، دەسەلاّت و پارە، لە نێو خۆیاندا ڕێک نەکەوتن، ناکۆکیی و چەن بەرەکیی دروسبوو، تا ئەنجامەکەی بە جەنگی نێوخۆ شکایەوە.
ئەوەبوو، ڕۆژی (1994/5/1)، بۆ یەکەم جار لە کوردستان، لە دوای ڕاپەڕینەکەوە، جەنگی نێوخۆ لە نێوان یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیمۆکراتی کوردستانی یەکگرتوودا دەستیپێکرد و تا ئەوڕۆش، بە شێوەیە لە شێوەکان، ئەو جەنگە ماڵوێرانکەرانەیە هەر بەردەوامە، بێ ئەوەی هیچ لایەکیان، ئاوڕێ لە قوربانیی و بەرژەوەندییەکانی ئەو گەلە هەژارە بدەنەوە.
ئەو جەنگە چەپەڵە ناڕەوا ناوەختە، ماوەی پتر لە سێ ساڵە لە ئارادایە. کارێکی زۆری لە هەموو بوارەکانی ژیانی(کۆمەلاّیەتیی، کلتوریی، ڕامیاریی، نەتەوەیی، ئابووریی و بازرگانیی) کردووە. بە شێوەیە تەنیوەتەوە، هەموو ناوچە و هەرێمەکانی کوردستانی گرتۆتەوە. جەنگەکە لە پارچەیەکەوە بۆ پارچەیەکی دیکەی کوردستان پەڕیوەتەوە. هەموو ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی دیکەی باشوور و کوردستانی مەزنیشی تێوەگلاوە. ڕیزەکانی نەتەوەی کوردی، بە تەواویی پچڕپچڕ و لەتلەت کردووە. بە هۆی بەرنامەی چەوت، بیری پاوەنخوازیی و کۆنترۆڵکردنی ناوچەکانی کوردستانەوە، بە هۆی دەسەلاّت و پارەوە، لە سەر کێشەی ڕابەریی و ڕۆڵی پارتی پێشڕەو، لە سایەی سەری سەرانی هەر دوو پارتە شەڕکەرەکەوە، جگە لە جەماوەری گەل، هیچ لایەنێ هێندە زیانی لێ نەکەوتووە، جگە لە دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستانیش، هیچ لایەنێ هێندە قازانجی نەکردووە.

## 1 / جەنگی نێوان پارتی ـ یەکێتی :

هێندێ ساویلکە هەن، تاوانی ئەم جەنگەی نێوخۆی نێوان پارتی و یەکێتی، لە ئەستۆی داگیرکەرانی کوردستان، ئەمێریکا و دەوڵەتەکانی خۆراواوە دەئاڵێنن! نازانم بۆ؟! بەڵگەیان بۆ ئەوە چییە؟! بۆ، ئەوان بە تاوانباری یەکەم دادەنێن؟! بە چ شێوەیە ئەوان توانییان، ئەو جەنگە نێوخۆیی یەی نێوان ڕێکخراوەکانی کوردستان هەڵگیرسێنن؟ گریمان، ئەوان هەڵیانگیرساند، ئەدی سەرانی کورد خۆیان چی بوون؟! بۆ گوێیان لە فەرمانەکانی ئەوان ڕاگرت؟

ئەز پێموایە، ڕێکخراوەکانی کوردستان خۆیان، هەموو ئەو جەنگە چەپەڵانەیان بەرپاکردووە، هەر خۆشیان دەتوانن، کۆتایی پێ بێنن، ئاشتیی گشتیی بچەسپێنن و یەکێتی ڕیزەکانی کورد بپارێزن.

بێگومان، لێرەدا نامەوێ، بە درێژیی، لە هەموو لایەنەکانی ئەو جەنگە بکۆڵینەوە و ڕوونیکەینەوە، بەڵام، پێشەکیی تەنیا چەن ڕاستییەک ڕووندەکەینەوە، پاشان، لە سەر چەن خاڵێکی سەرەکیی ڕادەوەستین.

گەر ئاوڕێ، لە مێژووی تێکۆشانی ئەم چەن ساڵەی، گەلی کورد لە باشووری کوردستاندا بدەینەوە، کەمێ بە وردیی، چاوێ بە ئارشیفی هەر دوو ڕێکخراوەکەدا بخشێنین، ئەوا بڕمان دەردەکەوێ، بۆچی ئەم جەنگە نێوخۆیی یە، بەو شێوەیە تەنییەوە و هەموو کونوقوژبنێکی خاکی کوردستانی گرتەوە. بە کورتیی :

1. ئەمە یەکەم جار نییە، ئاگری جەنگی نێوخۆ لە نێوان ئەو دوو لایەنەدا هەڵدەگیرسێ، بەڵکوو، پێشینەیەکی کەڵەکەبووی مێژوویی هەیە. وەک ئەو جەنگانەی لە نێوان ساڵەکانی (1964 - 1970) و (1976 - 1986)دا ڕوویانداوە.

2. هەموو جارێ دوای ئەو جەنگانە، ئاشبوونەتەوە و ڕێککەوتوونەتەوە. بەڵام، هەموو ئەو ئاشبوونەوە و ڕێککەوتننانە، لە بڕوایەکی پتەوی ڕاستەقینەی کوردانە و نیشتمانپەروەرانەوە نەبووە، بەڵکوو لە ناچاریدابووە، هەر وەک شتێکی کاتیی وابووە، بە شێوەیەکی بنەبڕیی، کۆتایی بە ناکۆکیی و گرفتەکانی نێوانیان نەهێناوە. واتە: جەنگەکەیان بۆ سەردەمێکی دیکە هەڵگرتووە.

3. هەموو کەسێتیی، ڕووناکبیر، نووسەر، ڕێکخراو، لایەنە کوردیی و کوردستانییەکان، کەم تا زۆر و هەر کەسە و هەر لایەنەی بە شێوەیە لە شێوەکان، بەرانبەر ئەو جەنگە نێوخۆیی یانە تاوانبارن، چونکە:
- کاتێ ساڵی (1992)، پارتی و یەکێتی، بە بڕیاری پەرلەمانی باشووری کوردستان، بە هاوکاریی لەشکری جەندرمەی تورک، پەلاماری هێزەکانی گریلای(P.K.K)یان دا، جەماوەری هەر دوو پارتە شەڕکەرەکە دەسخۆشانەیان لێ کردن، زۆربەی زۆری خەڵکە ڕووناکبیر، کوردپەروەر و بێلایەنەکەش بێدەنگبوون.
- کاتێ یەکێتی پەلاماری بزووتنەوەی ئیسلامیی دا، هیچ لایەنێ وەک پێویست، بێزاریی و نارەزایی خۆی دەرنەبڕی. بەڵکوو، پارتی ئەو هەلەی قۆزتەوە و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، یارمەتی ئەوانی دا، تا دژی یەکێتی هانیاندا و هاوپەیمانێ بۆ خۆی پەیداکا.
- هەروەها، کاتێ پارتی پەلاماری پارتی سۆسیالیستی دێمۆکراسی کوردستانی دا، خەڵکی بێدەنگبوون و یەکێتیش لە دژی پارتی و بۆ تۆڵەکردنەوە، یارمەتییەکی ناڕاستەوخۆی ئەوانی دا.
- لە ڕاستیدا، گەر پلەی نیشتمانپەروەریی و بەرژەوەندیی گەل ڕەچاوکرایە، دەبووایە، جەنگ لە نێوان هەر لایەکدا بەرپابووایە، بێ ئەوەی جیاوازییبکەن، هەر زوو جەنگەکەیان ڕیسواکردایە و دژی ڕاوەستانایە، تا لەوە زیاتر نەتەنیایەتەوە و بەڵگەشی بە دەس هیچ لایەکی دیکەوە نەدایە. بەڵام دیارە، کاتێ بەرژەوەندیی پارتایەتی تەسک، پێش بەرژەوەندیی نەتەوەیی یەوە دەخرێ، پێشبڕکێیەکی خراپ لە نێواندا دروسدەبێ، دڵڕەشیی، کۆنەقین و گێرەشێوێنیی، ڕۆڵی تایبەتیی خۆیان دەبینن، ئیدی ئەو جۆرە هەراوئاژاوە و جەنگە نێوخۆیی یانە، وەک بەرهەمێکی ئەو دید و بۆچوون و کارانە، لە کوردستاندا ڕوودەدەن.
4. دەتوانین، بە ڕاشکاویی بڵێین: ئەورۆ لە کوردستاندا، شتێ نییە، ناوی کێشەی کورد بێ. بەرژەوەندیی کورد و کوردستان، لە چەن دروشمێکی بریسکەداری خەڵک هەڵخەڵەتێنەر پتر، هیچی دیکە نییە. هەر چەند کەسێ کۆبنەوە، هێندێ پارە و چەکیان هەبێ، دەتوانن، ڕێکخراوێ بۆ خۆیان دروسکەن و چەن چەکدارێکی مشەخۆر، لە

دەوری خۆیان کۆ کەنەوە. چونکە گەر وا نەبووایە :
- کاتێ سوپای ئێران، بەبەر چاوی هەموو ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی باشـوور و کـوردسـتـانی مـەزنەوە، لە نـاوچەکـانی ژێر دەسـەڵاتی یەکێتیدا، پەلاماری پێشمەرگە و کادێرەکانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستـانی ئێرانی دا، بۆچی ئەوەیان لە سوپای ئێران و یەکێتی قەبوڵکرد؟ بۆچی بە هەموویان دژ نەوەستان و پەلاماریان نەدا؟!
- کاتێ پارتی بە یارمەتی سوپای بەعس، پەلاماری هێزەکانی یەکێتی دا و شـاری هـەولێـری داگـیـرکـرد، بۆچی هـەمـوو ڕێکخـراوە ڕامـیـارییـەکـانی کـوردسـتـان دژ نەوەسـتـان؟ بۆچی ئـەو کـارەیان بە ناپاکیی دا نـەنا و ڕەوایەتییان پێ دا؟ بە تـایبـەتی(P.K.K.) دەبووایە، لە هەموو کاتێ پتر، بیروباوەڕی کوردستانێتی خۆی بسەلماندایە و دژی هێزی بەعس بجەنگایە.
- کـاتێ پارتی بە یارمـەتیی سـوپای تورک، پەلامـاری هێـزەکـانی (P.K.K.)یان دا، دەبووایە، یـەکێتی داکۆکیی لێ بکردایە و دژی ئەو دوو لەشکرەی پارتی و تورک بجـەنگایە، نـەک چاوەڕوانی ئەنجـامی هێرش و پەلاماردانەکەی بکردایە، تا هـەمـوو لایەنەکانی ڕوونبێتەوە، ئەو کاتە هەلەکە بۆ بەرژەوەندیی خۆی بقۆزێتەوە و پەلاماربدا.
5. ئەر (یەکێتیی و P.K.K)، بە ڕاستیی کێشەی کوردیان مەبەس بووایە، بەرژەوەندیی پارتەکانی خۆیان، پێش بەرژەوەندیی نەتەوەکەوە نەخـستـایە، دیارە هەر لە سـەرەتاوە، ئەو هەلەیان لە کیس خـۆیان نـەدەدا، بە هـەر دووکـیـان لە کـاتی هەر دوو پەلامـاردانەکـەی، هێزەکانـی « پارتی - بەعس » و « پارتی - تورک »دا، داکۆکییان لە یەکدی و لە خـاکی کـوردسـتـان دەکـرد، قـوڵاییـەکی سـتـراتیـژیی و نەتـەوەیی یان بۆ خـۆیان دابیندەکـرد. ئـەو کـاتە، خـوێنی ڕۆڵەکـانی باکـوور، تێکەڵ بە خـوێنی ڕۆڵە و خـاکی باشـوور دەبوو، پێـوەندییـە نەتەوەیی یەکە هێندەی دیکە پتـەوتر و قووڵتر دەبوو. چونکە، تا خوێن و خـاک، لە هەمـوو پارچەکـانی کـوردسـتـاندا، تێکەڵ بە یەکـدی نەبن، مەحاڵە یەکێتیەکی نەتەوەیی، لە ڕیزەکانی نەتەوەی کورددا بەدیبێ.
6. بەم چـەن سـەرنجـەی سـەرەوەدا، بۆمـان دەردەکـەوێ، هەسـتی نەتەوەیی و بیری کوردایەتیی گەلێ لاوازە. تەنیا بەرژەوەندیی تەسکی

تاکەکەسیی، بنەماڵە و پارتایەتیی، پێش هەموو جۆرە بەرژەوەندییەکی دیکەوە دەخرێ. هەموو لاکان بێ جیاوازیی، سوود لە هەلی جەنگی نێوان دوو ڕێکخراوی کوردستانیی دیکە وەردەگرن، تا مەبەسەکانی خۆیانی پێ بەدیبێنن.

## ڕەوتی ڕووداوەکان :

1/ جەنگی نێوخۆ، لە شارۆچکەی « قەڵادزێ »وە دەستیپێکرد. گەر پارتی و یەکێتی، پێشەکی پلانێکی ئامادەکراویان بۆ جەنگەکە نەبووبێ، دەبووایە، هەر زوو جەنگەکەیان لە شوێنی خۆیدا ئابڵووقەبدایە و یەکسەر چارەسەرێکی بنەبڕییان بۆ بدۆزیایەتەوە، نەیانهێشتایە، پریشکی ئەو ئاگرە سوورە پڕ لە قینە، بۆ ناوچە نزیکەکانی دیکەی وەک ڕانیە و پاشتریش بۆ هەموو بەشەکانی دیکەی باشووری کوردستان بتەنێتەوە.
2/ یەکێ لە هەڵە هەرە گەورەکانی یەکێتی ئەوەبوو، دەسی بە سەر شاری هەولێری پێتەختی حوکوومەتی هەرێمدا گرت. پاشتریش پەلاماری پەرلەمانی کوردستانی دا و داگیریکرد. بەوە کێشەکە، لە ناکۆکیی، دووبەرەکیی و جەنگی نێوخۆ دەرچوو، وەک کۆدەتایەکی سەربازیی لێهات.
3/ هەموو لایەنەکان، چەن جارێ هەوڵیان لەگەڵ یەکێتیدا دا، شاری هەولێر چۆڵکا، پێکەوە دانیشن، دەمەتەقێ لە سەر ئەو گرفتانەی نێوانیان بکەن، چارەسەرێ بۆ ئەو بارودۆخەی کوردستان بدۆزنەوە، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، چونکە یەکێتی چۆڵکردنی هەولێری، بە داهاتی « برایم خەلیل »ەوە دەبەستەوە، تا وای لێهات، چارەسەرەکان لە تونێلێکی داخراودا مانەوە.
4/ داگیرکردنی هەولێر، لە(1996/08/31)دا، لە لایەن پارتییەوە، جگە لەوەی هەنگاوێکی ناپاکانەبوو، هێندەی دیکە بارەکەی ئاڵۆزتر کرد و گرفتەکانی نێوانیانی، بە تەواویی بێ چارەسەر هێشتەوە.
5/ بە باوەڕی من، هۆی ئەو هاوکارییەی پارتی ـ بەعس، بۆ چەن خاڵێ دەگەڕێتەوە :

1. ئەنجامێکی سروشتیی جەنگی نێوخۆ بوو.
2. بەڵەنسی تەرازووی هێزەکانی نێوان پارتی ـ یەکێتی تێکچووبوو. یەکێتی نزیکەی 70٪ی باشووری کوردستانی بە دەستەوەبوو، لە دوا پێکدادان و هێرشەکانی پێش (1996/8/31)یشدا، هەڕەشەیەکی گەورەی لە بارەگای سەرکردایەتی پارتی دەکرد.
3. هێزەکانی پارتی، لە بەردەم هێزەکانی یەکێتیدا لاوازبووبوون، توانای مانەوە، خۆڕاگرتن و بەرگریکردنیان کزبووبوو، ورەیان ڕووخابوو، لەچاو هێزەکانی یەکێتیدا، توانای جەنگییان کەمتربوو. بێگومان، پارتی بۆ ئەوەی ئەو کەموکوڕییانە پڕکاتەوە، پەنای بۆ بەر هێزی داگیرکەری عێراق برد.
4. ئێران بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، یارمەتیی هێزەکانی یەکێتی دەدا، وەک ئەوەی چاوی لە هەڵمەت و پەلاماردانەکانیان دەنوقاند، ڕێگەی هاتوچۆی بە ئێراندا بۆ کردبوونەوە.
5. کاتێ بە ئاگاداریی یەکێتی و لەبەر چاوی هەموو جیهان، لە مانگی (یولی/1996)دا، لەشکری ئێران سنووری نێودەوڵەتیی نێوان ئێران ـ عێراقیان بەزاند، پەلاماری بنکە و بارەگاکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ـ ئێرانیان دا، بە گوللەتۆپ و ڕاکێت دایانگرتنەوە، ماوەی سێ ڕۆژ لە باشووری کوردستاندا مانەوە، ئەو فاکتەرە پتر، ڕێگەی بۆ ئەو دەسپێشکەرییەی « مەسعوود بارزانیی » خۆشکرد، تا داوا لە دڕندەیەکی وەک « سەددام حوسێن » بکا، یارمەتییبدا و هێزەکانی بەعس بۆ کوردستان بانگکا.
6/ ئەوڕۆ، هەموو هاوکێشەکان پێچەوانە بوونەتەوە، پارتی دەسەڵاتی پترە، نزیکەی لە 70٪ی ناوچەکانی باشووری بە دەستەوەیە.
7/ پارتیی، هەمان هەڵەی کوشندەی یەکێتی دووبارەدەکاتەوە. بۆ یەکێتی ڕیزەکانی گەل و تەبایی نێوان ڕێکخراوە ڕامیارییەکان، شاری هەولێر چۆڵ ناکا و ڕێک ناکەوێ، بۆ ئاشبوونەوەی گشتیی، داننان بەو حوکوومەتەی هەولێری دوای (1996/8/31) دروسبوو، بە مەرجی سەرەکیی دادەنێ.
8/ دەتوانین، بڵێین: هەڵەی هەرە زەقی یەکێتی ئەوەبوو، لە (1997/10/13)دا، جارێکی دیکە پەلاماری سەنگەرەکانی پارتییان

دایەوە. لە کاتێکدا دەبووایە، سەرانی یەکێتی ئەوەیان چاک بزانیایە، چ داگیرکەرانی کوردستان و چ دەوڵەتەکانی بەرەی خۆراوا، ڕێگە نادەن، هیچ یەکێ لەو دوو لایەنە، بە تەواویی سەرکەوێ و دەس بە سەر هەموو ناوچەکانی باشووری کوردستاندا بگرێ. بە تایبەتیی کاتێ، (ئەمێریکا، بریتانیا و تورکیا) بە یەک دەنگ هاواریانکرد و داوایان لە یەکێتی کرد، بۆ پێش هێرشەکانی سیازدەی مانگ بکشێتەوە و هەموو ئەو جێگانەی لەو ماوەیەدا گرتبوویان، چۆڵیکەنەوە. دەبووایە، هەر زوو لەو بروسکە پەلەیەی ئەوان تێبگەیشتنایە و ئەو هەموو خوێنەیان بە خۆڕایی نەڕشتایە. چونکە، ئەمێریکا و بریتانیا بە ئاشکرا، ڕێگەیان بە لەشکری تورک دا، یارمەتی پارتی بدا. بۆیە تورکیاش، بە بۆمبای ناپاڵم، ڕاکێت، تانک و تۆپی قورس، سەنگەرەکانی هێزی هاوپەیمانی دیمۆکراسیی کوردستانیان وێرانکرد و ئەنجامەکەشی بە پاشەکشەکردن شکایەوە.

9/ بەو پێیەی پەرلەمان، گەورەترین دەسەلاتی یاسادانان و حوکوومەتی هەرێمیش، بالاترین دەزگەی جێبەجێکردنە، لەو ڕۆژەی جەنگی نێوخۆ، لە باشووری کوردستاندا دەسیپێکردووە، هەر دوو دەزگەی پەرلەمانی کوردستان و حوکوومەتی هەرێم، ڕەوایەتیی خۆیان لە دەسداوە. چونکە، لە لایەکەوە هیچ جۆرە دەسەلاتێکیان نەبووە و نییە، نەیانتوانیوە کارێ بکەن، ئاوێ بەو ئاگرەدا بکەن و جەنگەکە بکوژێننەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەندامانی هەر دوو لایەنەکە، وەک شەڕکەرێ لە جەنگەکەدا بەشدارییانکردووە.

10/ هەر چەندە، چ پارتی و چ یەکێتی، هەر یەکەیان وەک بنێشت، کۆمەڵێ ڕێکخراو و پارتی وردیلە، بە دامێنی ڕێکخراوەکانیانەوە نوساوون. بە هەموو لایەکیان دەیانەوێ، ڕەواییەک بەو دوو دەسەلاتەی هەولێر و سولەیمانیی بدەن. بەڵام، لە ڕاستیدا دوو حوکوومەت، لە دوو شاری نزیک لە یەکدی و لە بەشێکی کوردستانی بندەسی عێراقدا دروسبن، پتر مایەی پێکەنین و گاڵتەجاڕین، وەک لەوەی جێگەی باوەڕ و ڕێزی کۆمەلانی خەڵکی بن و دڵیان پێ خۆشکرێ. لەبەرئەوە، ئەو دوو حوکوومەتە، حوکوومەتی گەلی باشوور نین، بەڵکوو حوکوومەتی پارتەکانی خۆیانن، بۆیە بە هیچ شێوەیە ڕەوایەتییان نییە.

11/ حوکوومەتی گەل دەبێ، یەکگرتوو بێ و ڕاژەی ئامانجەکانی گەل بکا، جیاوازیی لە نێوان ناوچەکانی بادینان و سۆران، پارتی و یەکێتی و ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی دیکەی کوردستاندا نەکا، بە یەک چاو، لە ڕۆڵەکانی گەل و داگیرکەرانی کوردستان نەڕوانێ!
12/ هەموو لایەنەکان، بە تایبەتیی پارتی و یەکێتی، هێندە هەڵەوپەڵە و کەموکوڕییان هەیە، نە خۆیان، نە بزووتنەوەی کوردایەتیی و نە نەتەوەی کوردیش، پێویستی بەوە هەیە، هێڵێکی سوور لە نێوان هیچ لایەنێکدا بکێشرێ. چونکە، لە لایەکەوە گەر باسی ناپاکیی بکەین، لە ساڵی(1964)ەوە، هەموو لایەکیان، هێندە ناپاکییان بەرانبەر گەل کردووە، بە تەواویی بێلەزەتبووە و بە هیچ ئاوێ ناشۆڕرێتەوە.
لە لایەکی دیکەشەوە، گەر کورد خاوەنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بووایە، هەڵبەتە، یەکەم: ئەو هەموو ناپاکییانە ڕوویان نەدەدا. دووەم: هەر کەس و هەر لایەنێ، ناپاکیی بەرانبەر کوردستان و شۆڕشەکەی بکردایە، دەبووایە و دەتونرا، سزا بدرایە، چونکە ئەو کاتە کوردستان، دەزگەیەکی دەستووریی و یاسایی سەربەخۆی تایبەتیی خۆی دەبوو. بەڵام ئەوڕۆ، جگە لەوەی ئەو دەزگەیەمان نییە، بارودۆخە نالەبارەکەی نەتەوەی کوردیش، ڕێ بەوە نادا، سزای تاوانبار و ناپاکان بدرێ. لەبەرئەوە، با هێندەی دیکە جەنگە نێوخۆیی یەکە تەشەنە نەکا و پەرەنەسێنێ، گۆمە لێڵەکەی ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکییەکەی کوردیش، هێندەی دیکە قووڵ نەبێتەوە، چونکە لەم بارەی ئەوڕۆی کوردستانی پێدا تێپەڕدەبێ، گۆم تا قووڵبێ، مەلەی خۆشتر نییە!
13/ چ پارتی و چ یەکێتی، بە تەواویی، پشتیان بە هێزەکانی خۆیان نەبەستووە. چونکە، گەر لایەکیان، هانا بۆ یەکێ لەو دەوڵەتە داگیرکەرانە بەرێ، ئەوا لاکەی دیکەیان ناچاردەبێ، پەنا بۆ دەوڵەتێکی دیکەی داگیرکەر بەرێ، تا بتوانێ، بەڵەنسی نێوان هێزەکان، لە کوردستان و ناوچەکەدا ڕاگرێ. بۆیە، هەمیشە یەکێتی، پارتی بەوە تاوانباردەکا و دەڵێ: گەر لە ساڵی(1995)دا ئێران نەبووایە، گەر لە ساڵی(1996)دا سوپای عێراق یارمەتی نەدایە، گەر لە ساڵی(1997)دا، لەشکری تورک پشگیریی نەکردایە، هێزەکانی پارتیمان، تا زاخۆ ڕاودەنا و کوردستانمان لێ پاکدەکردنەوە. بە

هەمان شێوەش پارتی، دەڵێ: گەر ئێران نەبووایە، یارمەتیی یەکێتی نەدایە، ئەوا کۆتاییمان بە یەکێتی هێنابوو.
بەڵام بە داخەوە، ئەمە پتر لەوە دەچێ، ژیربێژیی و لۆژیک میوانی هەر دوو سەرکردایەتی پارتەکە نەبێ، ئەگینا دەبووایە، تەنیا بۆ جارێ بیریان لەوە بکردایەتەوە، بۆچی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانە، بۆ لەنێوبردنی یەکدی، هەر جارەی یارمەتیی لایەکیان دەدەن؟! بۆچی بۆ ئازادیی و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان، یارمەتییان نادەن؟! دیارە، خۆشیان ئەوە چاک دەزانن، بەڵام، دڵڕەشیی، کۆنەقین و نەخۆشیی ڕابەریی، وای لێ کردوون، پێکەوە نەگونجێن و بیر لەو جۆرە شتانە نەکەنەوە. بۆیە لە بری ئەوەی پێکەوە دانیشن، بە شێوەیەکی دیمۆکراسیی، بە دیالۆگێکی کوردانە و برایانە، چارەسەرێکی ڕامیاریی بۆ کێشە و گرفتەکانی نێوانیان بدۆزنەوە، هەموو جارێ پەنا بۆ بەر داگیرکەران دەبەن، وا دیارە هەرگیز پەند لە مێژوو وەرناگرن!
14/ هەر دوولایان هەڵە، تاوان، ناپاکیی، لاوازیی و تێکشکانی یەکدی، بە ئاواتدەخوازن، بە سەرکەوتنی یەکدی دادەنێن. لە هەمان کاتیشدا، هەر لایەنەی سەرکەوتنی خۆی، لە ژێرکەوتنی لایەنەکەی دیکەدا دەبینێ. بۆ نموونە: کاتێ سوپای ئێران، بە ئاگاداریی یەکێتی و لە ناوچەکانی بندەسی ئەواندا، پەلاماری بنکەکانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێرانیان دا، پارتی ئەو ڕۆژەی وەک جێژن لاوابوو. چونکە، یەکێتی بەوە تاوانباردەکرد، ناپاکییەکی نەتەوەیی کردووە. بە پێچەوانەشەوە، یەکێتی لە مێژبوو، چاوەڕوانی هەلێکی وای دەکرد، تا پارتی هەنگاوێکی ناپاکانەی وەک ئەوەی (1996/8/31) بنێ، بۆ ئەوەی داش بە داشیان لەگەڵدا بکا، هەمان هەڵە و ناپاکیی سی ساڵ لەمەوبەری خۆیان دووبارەکاتەوە.
15/ سەرکردەی هەر دوو ڕێکخراوەکە، هێندە داخ لە دڵ، لە خۆبایی و لوت بەرزن، گوێ بە هیچ جۆرە شتێ نادەن، لە هیچ کارێکی خراپ ناسڵەمێنەوە، تووشی غەڕاییەکی بێ وێنە بوون. بۆ نموونە: لێرەدا باسی یاری مار و پەیژەکەی ئۆکتۆبەری/1996 دەکەین. کاتێ پارتی، بە یارمەتی سوپای بەعس، هێزەکانی یەکێتی تێکشکاند، بە تەواویی لە کوردستان دەریپەڕاندن و تا سەر سنووری ئێران ڕاوینان،

«مەسعوود بارزانیی» لە سولەیمانیی، لە وەڵامی پرسیاری ژۆرنالیستێکدا، دەربارەی چارەنووسی یەکێتی و «جەلال تاڵەبانیی» گوتی: یەکێتی فینیش، واتە: تەواوبوون. لە کاتێکدا ئەو قسەیەی دەکرد، وای دەزانی، دوا سەربازی پۆستاڵڕەشی سوپای دەوڵەتی داگیرکەری عێراقی ڕاوناوە و دەوڵەتی بۆ کورد دامەزراندووە، وا بە شانازییەوە، ئەو قسەیە دەکا! هەر دوای ماوەیە. ڕۆژگار گۆڕا، ئەم جارەیان هێزەکانی یەکێتی، بە یارمەتی ئێران، چەکدارەکانی پارتییان لە ناوچەی سولەیمانیی ڕاونا، «جەلال تاڵەبانیی» لە گفتوگۆیەکی تێلێفۆنیدا لەگەڵ تێلیفیزیۆنی «MBC»دا گوتی: پارتی لە رووی ڕامیاریی و سەربازییەوە تێکشکا، دەبێ چەکەکانیان دانێن و خۆیان بەدەسەوەبدەن.

ئەمە گەر شتێ بگەیەنێ، لە لایەکەوە لەخۆباییبوون و غەڕاییەکی تەواوی هەر دوو سەرکردەی ڕێکخراوەکە پیشاندەدا. لە لایەکی دیکەشەوە، وا دیارە ئەو دوو سەرکردەیە زۆر ساکارن، بە تەواویی لە بارودۆخی ناوچەکە و ڕۆڵی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکە نەگەیشتوون، ئەگینا ئەو جۆرە قسانەیان نەدەکرد!

16/ لە ڕاستیدا، ئەو ناکۆکیی، دووبەرەکیی و جەنگە نێوخۆ خوێناوییەی، ئەورۆ لە نێوان پارتی و یەکێتیدا دروسبووە، تەنیا لە سەر کێشەی ڕابەریی و دەسەڵاتی ڕامیاریی کوردستانە. ئەندامانی سەرکردایەتیی و ڕێکخستنی هەر دوو لاشیان، هێندە لاوازن، توانای هیچ جۆرە بڕیارێکیان نییە. بەڵکوو هەموو بڕیارەکان، تەنیا لە قوولی مشتی هەر دوو سەرکردە (مەسعوود بارزانیی و جەلال تاڵەبانیی) دان. بۆیە گەر ئەو دوو سەرکردەیە بیانەوێ، بیرێ لە بەرژەوەندییەکانی گەلی باشووری کوردستان بکەنەوە، دەتوانن، بێ ئەوەی پرس بە کەس بکەن، بە یەک سووکە بڕیار، کۆتایی بە هەموو ناکۆکییەکانی نێوانیان بێنن، ئاوێ بەو ئاگری جەنگەدا بکەن و هەڵە مێژوویی یەکەش لە فەوتاندن قوتارکەن.

17/ ئەو کارە خراپانەی بەعس فریا نەکەوت، لە کوردستان بە ئەنجامیگەیەنێ، هەر دوو لایان، لە ماوەی ئەم سێ ساڵی جەنگی نێوخۆیەدا، بۆیان تەواوکرد. با لێرەدا نموونەیەک بێنینەوە.

تێلێفیزیۆنی « MBC »، له بەرنامەی حەفتانەی خۆیدا (دیالۆگ لەگەڵ خۆراوادا ـ Dialogue with the West)، باسێکی له سەر گرفتەکانی عێراق و گەلی کورد پێشکەشکرد. « نزار حەمدون » یش وەک نوێنەری عێـراق، له کۆمـەڵـەی نەتەوه یەکگرتووەکـان، بەشـداریيکرد. یەکێ لێی پرسی: ئێوه ژینۆسایدی کوردەکان دەکەن. ئەویش گوتی: ئەوه شتێکی ڕاس نییـه، چونکه، ئێـمـه مـاوەی شـەش سـاڵە باکـووری عێـراقـمـان بەجێـهێشـتووه، بـەڵام، کوردەکـان له نێو خۆیاندا یەکدی دەکوژن! جا گەر ئەو دوو سـەرکردەیه، به قـسـەی ئەو دوژمنه سـەرسـەختـەی کـورد، هۆشێ بەبەر خـۆیاندا نەهێـننەوه، پێموایه به هیچ جۆرێ، شایسـتـەی ئەوه نین، جەماوەر بڕوایان پێ بکا و ڕێزیان لێ بگرێ.

18/ پێویسـتـه به زووترین کـات، هـەر دوو سـەرکـرده دانیـشن، به هـەر دوولایان ئاشـتـییەکی گشـتـیی له کـوردسـتـاندا دابینکەن. ناکـۆکـییـه لاوەکـیـیـەکـان وەلاخـەن، حـوکـوومـەتێکی کـاتیی له هـەمـوو لایەن و تـەکنۆکـــراتـەکـــانـی کـــورد دامـــەزرێـنن، هەڵبـــژاردنێکی ئـازاد و دێمـۆکـراسـییـانه له کـوردسـتـاندا بکەن، پەرلەمـانێکی شـەرعـیی هەڵبـژێرن، ئیـدی بۆ تاهـەتایه، کـۆتایی به هـەمـوو جـۆره ناکـۆکـیی، دووبەرەکیی، جەنگی نێوخۆ و ناپاکییەک بێنن. لایه به لای جەماوەری ڕەشوڕووت، برسیی و لێقەوماوانی گەلەکەماندا بکەنەوه، ئەو پارەیەی بۆ چەک، تـەقـەمـەنیی و کـەرەسـەی جـەنگیی تەرخـانیـدەکـەن، با له ئاوەدانکردنەوەی کـوردسـتـان، تێـرکـردنی سکی برسـیـیـەکـان و خۆشگوزەرانیی کۆمەلانی خەڵکیدا خەرجیکەن.

## 2 / جەنگی نێوان پارتی ـ P.K.K.

پێشتر گوتمان: گەر ئازادیی و دیمۆکراسیی لە ئارادا نەبوو، ئەوا جیاوازیی نێوان بەرنامە و ستراتیژی پارتەکان،، بە شێوەیەکی گشتیی، ناکۆکیی، دووبەرەکیی و جەنگی نێوخۆی لێ دروسدەبێ. هێندێ جاریش ناپاکیی نەتەوەیی لێ پەیدادەبێ. جێی خۆیەتی. گەر لێرەدا، سەرەتا شتێ دەربارەی (P.K.K.) روونکەینەوە :

1. لە رووی ئایدۆلۆژی رامیاریی و شیکردنەوەی باری کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە، بە رێکخراوێکی (مارکسیی ـ لێنینیی) ناوی رۆیشتووە. لە رووی ستراتیژەوە، بە رێکخراوێکی رامیاریی کوردستانی دەناسرێ. ستراتیژی نێوەندیی .P.K.K، خۆی لە رزگارکردنی کوردستان، یەکێتی کورد و دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەککگرتووی سەربەخۆدا دەنوێنێ.

2. کوردستان بە کۆڵۆنیایەکی نێودەوڵەتیی و دەوڵەتە داگیرکەرەکانیش، بە کۆلۆنیالیزم دادەنێ.

3. بەپێی ئەو ستراتیژە نەتەوەیی یە بێ، .P.K.K دان بەو سنوورە دەسکردانەی نێوان پارچەکانی کوردستاندا نانێ، کە دەوڵەتە زلهێزەکان و داگیرکەرانی کوردستان، دوای جەنگی یەکەمی جیهان رەنگیانرشتووە.

4. هەموو خاکی کوردستان، بە یەک یەکەی جوگرافیای لێکدانەبڕاو، نەتەوەی کوردیش، بە یەک یەکەی ئیتنی پێکەوە گرێدراوی توندوتۆڵ دادەنێ. لە هەمان کاتیشدا، بە یەک چاو لە هەموو گرفتە نەتەوەیی یەکانی کورد دەروانێ، گرفت و دەردە سەرەکییەکانیشی، لە یەکدی جیا ناکاتەوە و وەک یەک چارەسەریان بۆ دەدۆزێتەوە.

5. بەو پێیە، رێکخستنی لە هەر چوار پارچەکەی کوردستان و لە نێو کوردەکانی دەرەوەی وولاتدا هەیە.

6. هەموو کوردستان، بە مەڵبەندی کارگوزاری خۆی دەزانێ، لە هەر بەشێکی کوردستاندا، بۆی لەباربێ و بگونجێ، لەوێوە دەسپێدەکا و زەبری گورچکبڕ لە دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان دەدا.

7. ئەورۆ .P.K.K پێی وایە، کلیلی رزگاریی، سەربەخۆیی و

چارەسەرکردنی کێشەی کورد، لە باکووری کوردستان دایە. بۆیە دەبێ، شۆڕش لە باکووری کوردستانەوە دەستپێبکا، بە هەموو شێوەیە هەوڵدرێ، دژی داگیرکەری دەوڵەتی تورک خەباتبکرێ، ناکۆکییەکانی نێوان گەلی کورد، لە پارچە جیاجیاکانی دیکەی کوردستاندا، لەگەڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکاندا خاوکرێنەوە و جۆرە دانوستانێ پێڕەوکرێ.

8. بڕوای بە هەموو شێوازە جیاوازەکانی خەباتی « ڕامیاریی، چەکداریی، دیپلۆماسیی، خۆپیشاندان و مانگرتن .. تاد » هەیە. لە بواری خەباتی سەربازییدا، « شۆڕشی چەکداریی، جەنگی پارتیزانیی و جەنگی درێژخایەن » پیادەدەکا. بۆ ئەم مەبەسەش، لە پەلاماردانەکانیدا دژی سوپای تورک، باشووری کوردستان لە ڕووی کاری جەنگ و لەشکرکێشییەوە، بە قووڵاییەکی ستراتیژیی هێزەکانی خۆی دادەنێ. گەلی باشووریش وەک سەرچاوەیەک وایە، هێز و توانا مرۆیی و گیانییەکانی خۆی لێوە هەڵدەهێنجێ. خۆراوای کوردستانیش، وەک « ئێسگەیەکی حەوانەوە، خۆکۆکردنەوە، بنکەیەکی ڕامیاریی و دیپلۆماسیی و هێزێکی لەبن نەهاتووی گریلاکانی » تەماشادەکا.

9. بۆیە، کاتێ لەشکری تورک، هێرشە بەرفراوانەکانیان، بۆ سەر بنکەی گریلاکانی .P.K.K دەسپێدەکەن، هێزەکانی گریلا ناچاردەبن، خۆیان تێکەڵاوی ئەو بەرەنگاربوونەوە و جەنگە قورسانە نەکەن. لەبەرئەوە پاشەکشەدەکەن، هەڵدێن و خۆیان دەشارنەوە. چونکە، هێزەکانی گریلا، تا ئێستە لەو ئاستەدا نین، تا وەک پێویست بەرەنگاری لەشکرێکی مۆدرێنی پڕ چەکی خاوەن توانای ئابووریی ببنەوە. لەبەرئەوە، هێندێ جار سنووری نێودەوڵەتیی نێوان هەر دوو دەوڵەتی تورکیا و عێراق دەبەزێنن، لە باکوورەوە بۆ باشوور دەگوێزنەوە، تا لە دەس پەلاماردانی سوپای داگیرکەری تورک، خۆیان ڕزگارکەن. لە باشوور خۆیان حەشاردەدەن، دەحەوێنەوە، سەرلەنوێ خۆیان ئامادەدەکەنەوە و بە بیروباوەڕێکی پۆڵایین و بە گوڕێکی نوێوە، جارێکی دیکە پەلاماردەدەنەوە.

10. ئا لێرەوە، ناکۆکیی و جەنگی نێوخۆ، لە نێوان .P.K.K و هێزەکانی باشووردا دروسدەبێ.

ســـەرەڕای هەمــوو ئەو شــتــانەی لە ســـەرەوە، دەربارەی .P.K.K باسـمـانكردن، لێـرەدا پێـويستـە، چەن ڕاسـتـييـەكی ديكە، دەربارەی بارودۆخـی كوردسـتـان، دەوڵەتە داگيركـەرەكـان، پێـوەندیی نێـوانيان و .P.K.K خۆشی ڕوونكەينەوە :

1/ ئێمـەی كـورد بمانـەوێ و نەمانەوێ، خـۆشـيـمانبێ و ترشـيـمـانبێ، چەن كـــوردپەروەر و نـيـشــتـمــانپــەروەربين، چەن بڕوا بەو سنووره دەسكردانە نـەكـەين، هێـشـتـا ئەورۆ، ئەو چوار ديوارە دەسكردەی، لە نێوان بەشـەكانی كوردسـتـاندا دروسكراون و دوژمن ناوی سنووری لێ ناون، بە چوار سنووری نێودەوڵەتيی دادەنرێـن. ئەوەتەی ئەو دەوڵەتانە دامـەزراون، لە لايەن دەوڵەتەكـانی جيـهـان، ڕێككەوتننامـە و دەسـتـووره نێـودەوڵەتيی و دەزگـەی كـۆمـەڵەی نەتەوە يەككگرتووەكانەوە، دانی پێدا نراوە. هـەر چەنـدە، .P.K.K بڕوای بـەو سنووره دەسكـردانە نـيـيـــە، بەڵام، باوەڕ و ئارەزوو شـتـێكە، باری ڕيالـيـزمـيش شـتێكی ديكەيە و پێكەوە هـەڵ ناكەن.

2/ لەبەرئەوەی ئـەورۆ، كـوردسـتـان ووڵاتە و دەوڵەت نـيـيـە، سـنووريكی ڕامــيـاريی دياريكراو و دانپـێـانراوی نـيـيــە، بە ســـەر پێنج دەوڵەتدا دابەشكراوە، تەنيا ئەو سنووره دەسكردانە، بە شێوەيەكی ڕەسميی لە هەمـوو جـيــهـاندا دەناسـرێن. لەبەرئەوە، گـەر هەر كـوردێ بيـەوێ، ســـەردانـی بەشــێـكی ديكەی كــــوردســـتـــان بكا، يا لە بەشــێـكی كــوردســـتــانەوە بۆ بەشـێكی ديكەی بگوێزێتــەوە، پێـشــەكی دەبێ، ڕەزامـەنديی ئەو دەوڵەتە داگــيـركــەره وەرگــرێ. واتە: هيچ كـوردێكی دانيـشـتـووی ئەو چوار دەوڵەتە، (مـەگەر بە دزييـەوە و بەقـاچاغ لە يەكێ لە ناوچـەكانی دەوڵەتەكـەی ديكە بژی) ئەگينا بۆی نيـيــە، بێ ڤـيـزە و ڕەزامــەنديی ئەو دەوڵەتە، پێ لە خــاكی بنێ، يا لـەوێ بژی. ئەمــە وەك ياسا و دابودەستوورێكی نێودەوڵەتيی، لە هـەموو جيهاندا پێڕەودەكرێ و لەم بوارەدا هيچ جۆره پۆزشێكی ياسايی نادۆزرێتەوە.

3/ لە ڕووی باوەڕی نـەتەوەيی يەوە، گـەر شـۆڕشـێكی سـەرتاسـەريی كوردستانی بەرپاكرێ، ئەوا ڕێكخـراوە ڕامـياريـيـەكانی كوردسـتـان، مــافی ئەوەيان هەيە، لە هـەر پارچـەيـەكـدا بيـانـەوێ و بۆيان لەباربێ، ئەســپی خـەباتـی خـۆيانی تێـدا تاودەن، يا وەك قـولايـيـەكی مـرۆيی،

جوگرافیی و ستراتیژیی، هەموو بەشەکانی کوردستان بەکاربێنن.
بەڵام، گەر شۆڕشەکە، لە پێناوی مافەکانی ئۆتۆنۆمیی - فیدراڵیدا بوو، تەنیا لە چوارچێوەی بازنەی یەکێ لەو دەوڵەتە داگیرکەرانەدا هەڵگیرسا، ئەوا ئەو مافەیان ناکەوێ. چونکە، لەو کاتەدا سنووری نێودەوڵەتیی، ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ و گرفتێکی مەزن بۆ دەوڵەتەکانی دیکە دروسدەکا. لە هەمان کاتیشدا، لە ڕووی یاسایی و دەستووری نێودەوڵەتانەوە، دەوڵەتە داگیرکەرەکانیش مافی ئەوەیان هەیە، داکۆکیی لە سنووری دەوڵەتەکەی خۆیان بکەن و پارێزگاریی لێ بکەن، دەتوانن، ڕێگە لە شۆڕشگێڕەکانی کورد بگرن، نەیەڵن، سنوورەکانیان ببەزێنن و قووڵایی ئەو دیو سنوورەکانیان بەکاربێنن، ئەویش لە بەر ئەم خاڵانەی خوارەوە:

1. ئاژاوە و جەنگی دەوڵەتەکەی بەرانبەر لە کۆڵ خۆیان دەکەنەوە.
2. شۆڕشەکە کار لە کوردەکانی بندەستی خۆیان نەکا.
3. بارودۆخی نێوخۆی هەر دوو دەوڵەتەکە بە ئارامیی ڕاگرن.
4. بەڵەنسی تەرازووی هێزەکان لە ناوچەکەدا تێک نەدەن.
5. کار لە بەرژەوەندیی زلهێزەکان نەکا، چونکە ئەوانیش، بەو سنووربەزاندن و هەراوئاژاوەیە لە ناوچەکەدا ڕازی نابن.

4/ پارتی و یەکێتی، وەک دوو ڕێکخراوی ڕامیاریی گەلی باشووری کوردستان، تەنیا لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا کاردەکەن. دروشمی ستراتیژیی هەر دوو ڕێکخراوەکە، لە دوو بەش پێکهاتووە: بەشی یەکەمیان، لە پێشدا داوای دێمۆکراسیی بۆ عێراق دەکەن. بەشی دووەمیشیان بەرنامەی لانی کەمیان ئۆتۆنۆمیی و لانی زۆریشیان، خۆی لە فیدراڵیدا دەنوێنێ. واتە: دوو ڕێکخراوی نەتەوەیی سەرانسەریی نین. ئەو بەرنامە و ئامانجانەیان، لەگەڵ بەرنامە و ئامانجەکانی P.K.K. دا ناگونجێ، لەبەرئەوە پێکدادان لە نێوانیاندا دروسدەبێ.

5/ چ پارتی و چ یەکێتی، لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی خۆیاندا، وەک دوو ڕێکخراوی باشووری کوردستان، بە توانا و خاوەن دەسەڵات، لە نەشونماکردن و گەشەسەندنی P.K.K. دەترسن. بە تایبەتیی پارتی زیاتر دەترسێ، چونکە :

1. دەڤەری بادینان لەچاو دەڤەری سۆراندا، لە باکووری کوردستانەوە نزیکترە، .P.K.K دەتوانێ، بیروباوەڕەکانی خۆی لەو ناوچەیەدا، بە شێوەیەکی ئاسانتر بلاوکاتەوە و کار لە دانیشتووانی ناوچەکە بکا.
2. هەر دوو ناوچەکە بە یەک دیالێکت دەپەیڤن، ئەمەش لە رووی تێگەیشتن و گونجانەوە، کاریگەرێتییەکی تایبەتیی خۆی هەیە.
3. ئەوەتەی ناوچەی بادینان هەیە، سیستێمی یەک پارتی تێدا پێڕەودەکرێ. پارتی وەک ڕێکخراوێکی باشووری کوردستان، لەو ناوچەیەدا، تەنیا پارت، بالادەس و ڕێبەربووە. ئەوڕۆ تەنیا .P.K.K دەتوانێ، لەو ناوچەیەدا بەربەرەکانی پارتی بکا. دیارە، لە ئەنجامی ئەو سیستێمە و دیکتاتۆریی پارتی و بنەماڵەی بارزانییدا، هێندێ هێزی ئۆپۆزیسیۆن دروسبوون، هێندێ لەو هێزانەش، باوەش بۆ باوەڕ و دید و بۆچوونەکانی .P.K.K دەکەنەوە. بەوە پارتی وردەوردە، دەسەلاتی دیکتاتۆرانە و تاقانەی ڕەهای خۆی لە دەسدەدا.
4. بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، هەڕەشە لە هەموو بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی پارتی دەکا.
5. پێوەندیی نێوان پارتی و دەوڵەتی داگیرکەری تورک تێکدەدا.
6/ .P.K.K وەک پارتێکی مەزن، خاوەن هێز و توانای کوردستانیی، هەر وەکوو ئەو هەموو خەسڵەتە باشانەی هەیە، هێندێ کەموکوڕیشی هەیە. لەوانە:
1. ئەندامانی .P.K.K، پێ لە سەر خەباتێکی وشکی ئایدۆلۆژیی دادەگرن، کە سەردەمەکەی بە تەواویی کزولاوازبووە.
2. بڕوایەکی تەواویان، بە ڕۆڵی سەرکردە و ڕابەری تاقانە هەیە. هەموو دەسەلاتەکان لە قوولی مشتی سکرتێری گشتیی « عەبدوڵلا ئۆجەلان »دا کۆ کراونەتەوە. ئەوەش بە مەترسییەکی گەلێ مەزن، بۆ سەر پاشەڕۆژی ڕێکخراوەکە دادەنرێ.
3. پێوەندییەکی نابەرابەر و نائاسایی، لە نێوان .P.K.K و دەوڵەتی داگیرکەری سووریادا هەیە. ئەو پێوەندییە بە شێوەیەکە، لە داهاتوودا مەترسییەکی گەورەی لێ چاوەڕوان دەکرێ.
4. جیاوازیی لە نێوان بارودۆخی کوردستان و ئەورووپادا ناکەن. لەو دەوڵەتانەی ڕێکخستنیان تێدا هەیە و بەهێزن، هێندێ جار، خەباتێکی

تێژڕەوانە پێڕەودەکەن. جگە لەوەی ئەو خەباتە، زیان بە خۆیان، ناو و ناوبانگی کورد و کێشە ڕەواکەمان دەگەیەنێ، لەگەڵ ڕەوشی یاسایی و دیمۆکراسیی ئەورووپاشدا ناگونجێ.
بۆ نموونە: لە ئەنجامی ئەوەی، لە دەوڵەتێکی وەک ئەڵمانیای فیدراڵدا، هێندێ کـاری هەڵەیان بە ئەنجـامگەیاند، لە (1995/11/26)ەوە، چالاکیی ڕامیـارییان لێ قەدەغەکردوون. هەر چەندە لەم دواییانەدا، سکرتێری گشتییان « عەبدوڵلا ئۆجەلان »، داوای لە ڕێکخستنەکانی دەرەوەی وولات کرد، خۆڕاگر و نەرمونیان بن، لە کردەوەی توندوتیژیی خۆیان بە دوورگرن. بەڵام تا ئەورۆ، دەوڵەتی ئەڵمان بڕیاریان نەداوە، ئەو قەدەغەیەیان لە سەر لابەرن.
5. لە هێندێ شتدا، خۆیان لە سەرجەمی نەتەوەکە جیادەکەنەوە. بۆ نموونە: لە دەردوەی کـوردسـتـان، لە هەمـوو ئەو دەوڵەتانەی ڕێکخستنیان هەیە، تێکەڵ بە دەزگە کوردییەکان نابن، بەڵکوو دەزگەی تایبەتیی خۆیان دادەمەزرێنن. ئالایەکی تایبەتییان بۆ خۆیان داناوە، بە هیچ شێوەیە، فرِی بە سەر ئالای کوردستانەوە نییە، بەڵکوو تەنیا ئالای ڕێکخراوەکەی خۆیانە، باوەڕیش بەو ئالایە ناکەن، کە لە شۆڕشە کۆنەکانی کوردەوە، وەک یادگارێ بۆمان بەجێماوە.
6. هێندێ جار، زۆر توندڕەو و پەڕگیر خۆیان پیشاندەدەن، حسێب بۆ باری پڕ لە ئالۆز و پێوەندیی نێوان هێزەکان ناکەن، چۆنیان بوێ، نەخشە و پلانەکانی خۆیان، بەو چەشنە دادەڕێژن و پیادەدەکەن، کە هێندێ جار، زیان لە بەرژەوەندیی بەشەکانی دیکەی کوردستان دەدا.
بۆ نموونە: لە سالّی (1992)دا، لە باشوور حوکوومەتێکی فیدراڵیی دامەزرا، بەڵام ئەوان زۆر گوێیان بەو بارودۆخە نوێیەی باشوور نەدەدا، ڕێزیان لە حوکوومەتەکە نەدەگرت و دانیان پێدا نەدەنا.
لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم چەن کەموکوڕیی یانەیان هەیە، لە هەمان کاتیشدا، هێندێ خەسلەتی چاکەشیان هەیە، کە لە هەموو ڕێکخراو و پارتەکانی دیکەی کوردستانی مەزن جیایاندەکاتەوە. بۆ نموونە: زۆر کوردانە و کوردستانیانە بیردەکەنەوە. گەلێ دلسۆزی پارت، نیشتمان و نەتەوەکەی خۆیانن. دیسیپلینێکی بەرز و پتەوی پارتایەتییان هەیە. دەس و دەم و دڵپاکن. ڕقوکینەیان بەرانبەر یەکدی نییە و هەڤاڵەکانی

خۆیان خۆشدەوێ. لە بواری تێکۆشانی ژناندا، شۆڕشێکی مەزنیان لە کۆمەڵگەی کوردەوارییدا بەرپاکردووە. گەلێ بایەخ بە کاری ڕووناکبیریی، نووسین و خوێندنەوە دەدەن. کادێرێکی زۆری ڕووناکبیریی و ڕامیارییان هەیە. لە ڕووی ئابوورییەوە، بە تەواویی پشتیان بە خۆیان بەستووە. گەورەترین کاریّ کردبێتیان و مایەی شانازیی هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر بێ، دامەزراندنی تێلێفیزیۆنی مەدە ـ MED TV. جگە لە پەڕلەمانی کوردستان و چەندین ئینستیتووتی کوردیی، لە وولاتە جۆربەجۆرەکانی ئەورووپا دایان مەزراندوون، کە هەر یەکەیان لە بواری کاری ئەکادیمیی و کەلتووریدا، ئەرکی نەتەوەیی سەرشانی خۆیان جێبەجێدەکەن.

7/ یەکەم جار، لە(ئۆکتۆبەری/1992)دا، پەڕلەمانی فیفتی فیفتی کوردستان، یەکەم بڕیاری خوێناویان ئەوە بوو، بە هەر دوو ڕێکخراوەکە (پارتی و یەکێتی) و بە هاوکاریی سوپای تورک، بە بیانووی سەرکێشیی و کاری « تیرۆریستی! »وە، لە گریلاکانی P.K.K. یان دا.

8/ لەبەرئەوەی ئەوڕۆ، جەنگی نێوخۆ، لە نێوان پارتی و یەکێتی لە گۆڕێدایە، هەر هەمان ئەو یەکێتییەی ساڵی(1992)، بەشداریی لە لێدانی هێزەکانی P.K.K. دا کرد، ئەوڕۆ پشگیرییان لێ دەکا. بە باوەڕی من، ئەمەش بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە، یەکێتی چاوی بە هەڵەکانی خۆیدا خشاندبێتەوە، یا لە دید و بۆچوونێکی نەتەوەیی یەوە، ئەو هەڵوێستەی وەرگرتبێ، بەڵکوو پێڕەوی ئەو پەندە کوردییە دەکا، کە دەڵێ: (دوژمنی دوژمنم دۆستمە).

## سەرئەنجام :

ئەورۆ نەتەوەی کورد لە جیهاندا، بە تەنیا گرووپی هەرە گەورەی ئیتنیی دەژمێررێ، کە لە ژێر باری بندەسیی و چەوساندنەوەی نەتەوەییدا دەناڵێنێ، خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆی نییە. تەنانەت وا خەریکە فەلەستینییەکانیش، دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان دادەمەزرێنن، کە بە ڕووبەری خاک، کوردستان « 25 » جار لە ڕووبەری هەموو خاکی دەوڵەتی ئیسرایل گەورەترە. بە ژمارەی دانیشتووانیش، « 10 » هێندەی ژمارەی فەلەستینییەکان و « 6 » هێندەی ژمارەی هەموو دانیشتووانی ئیسرایل دەبێ.
شۆڕشی گەلی کوردستان، لەم سەردەمەی ئەورۆماندا، بە تەنیا شۆڕش و بە دوا شۆڕشی مەزنی « نەتەوەیی، ڕامیاریی و چەکداریی » گەلانی چەوساوەی ناوچەکە و جیهانیش دادەنرێ. بۆیە، گەر سەرکردایەتییەکی دڵسۆز، نیشتمانپەروەر، زیرەک و ڕێکوپێکی هەبێ، لە دوارۆژێکی نزیکدا دەتوانێ، سەرنجی ڕێکخراو، گەلان و دەوڵەتە پێشکەوتووخوازەکانی جیهان، بەلای خۆیدا ڕاکێشێ، لەبەرئەوە، هیچ جۆرە گومانێکی تێدا نییە، پشتیووانییەکی تەواویی لێ دەکرێ، ڕۆژێ لە ڕۆژانیش هەر دەبێ، سەرکەوێ و ئامانجە نەتەوەیی یەکانی خۆی بەدیبێنێ.
جگە لەوەی دەتوانرێ، گرەو لە سەر هەڵوەشاندنەوەی، هەر چوار دەوڵەتە تێریتۆریاڵە داگیرکەرەکەی کوردستان بکرێ، سنوورەکانیش ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر دەگۆڕێن، سەرلەنوێ نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەندیش دادەڕێژرێتەوە و باری جیۆپۆلیتیکی ناوچەکە و جیۆستراتیژیی نێودەوڵەتانیش، چاوی پێدا دەخشێنرێتەوە. گەلانی (ئەرمەن، ئازەر، بلوچ و ئاسووری )یش، لەو پرۆژە گەورەیەی گۆڕانی، نەخشەی هەر چوار دەوڵەتەکەدا بەشداردەبن، پاڵپشتێکی مەزن و قەلایەکی قایم، بۆ شۆڕشی کوردستان دابیندەکەن.
هەر چەندە تا ئەورۆ، نەتەوەی کورد دۆستی ستراتیژیی نییە. هەر وەک چۆن لە کۆندا، ئەمێریکا و دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی ئەورووپا، لە درزی بەرژەوەندییەکانی ئێرانەوە، تەماشای کێشەی کورد و

شۆڕشەکەیان دەکرد، ئەورۆش بە هەمان شێوە، لە ڕوانگەی بەرژەوەندییەکانی تورکیای هاوپەیمانی ئەندامی ناتۆیانەوە، لە کێشە ڕەواکەی کورد و شۆڕشەکەی دەڕوانن. چونکە، لای ئەمێریکا نەوت لە مافی مرۆڤ بە نرخترە، تورکیا وەک هاوپەیمانێکی ستراتیژیی، بە سەدان جار لە کێشەی کورد و دیمۆکراسیی گرنگتر و لەبەرچاوترە.
بەڵام، ئەو بارودۆخە هەروا بەردەوام نابێ، گۆڕەپانەکە بە تەنیا، بۆ ئەمێریکا و هاوپەیمانەکانی چۆڵ نابێ، بەڵکوو دەبێ، گۆڕانکارییەکی گەورە و گرنگ، بە سەر بارودۆخی ناوچەکە و جیهاندا ڕوو بدا. دەبێ، بەڵەنسی تەرازووی هێزەکان، نەخشەی ستراتیژیی و جیۆستراتیژیی زلهێزەکانی جیهان بگۆڕێ.
بێگومان، بەو پێیەی نەتەوەی کورد، لە چوارچێوەی سنووری ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەدا دەژی، لێرەدا پێویستە، بە کورتیی باسی دەستەی فەرمانڕەوایان و هێزە ڕامیارییەکانی گەلانی باڵادەسی ئەو دەوڵەتانە بکەین.
ئەو چوار دەوڵەتە داگیرکەرەی کوردستان، بە هیچ شێوەیە، دان بە مافی چارەنووسی گەلانی بندەسیاندا نانێن. هەروەها، ڕێکخراوە چەپە ڕامیارییەکانیش، لە چەن ڕێکخراوێکی ڕاڕا، هەلپەرست و گەلێ جاریش بێ هەڵوێست پێکهاتوون. پتر لە ژێر کارتێکردنی دید و بۆچوونەکانی کاربەدەسانی دەوڵەتەکان دان. لە ڕوانگەی بەرژەوەندیی نێوکۆیی چینی پرۆلیتاریای ئەو دەوڵەتانە و ڕێکخراوەکانی خۆیانەوە، تەماشای کێشەی کورد دەکەن و چارەسەری بۆ دەدۆزنەوە. دەتوانم، بە ڕاشکاویی بڵێم: لە کۆندا چەپی « تورک، عەرەب و فارس »، تەنیا بیروڕا و بۆچوونەکانی « مۆسکۆ »یان کاوێژدەکردەوە. ئەورۆش بە تەواویی لە گۆڕانکاریی و بارودۆخە نەتەوەیی و نێونەتەوەیی یەکە نەگەیشتوون، لە هەموو چەپی گەلانی دیکەی باڵادەسی جیهان، لە ئاستی کێشەی نەتەوەیی کورددا خراپتربوون. تەنانەت چەپەکانی ئیسرایل، گەلێ لە چەپی ئەو چوار دەوڵەتە باشتربوون. بۆیە، بەو شێوەیە لە کاروان بەجێماون و چەندین ساڵە هیچیان بە هیچ نەکردووە. سەیر ئەوەیە، زۆربەشیان دان بە هەڵە و تاوانەکانی خۆیاندا نانێن!

هێزە ئیسلامییەکانیش، تەنیا لە کلاورۆژنەی ئایین و سەرکەوتنی ڕێکخراوەکانی خۆیانەوە، لە کێشەی نەتەوەیی و ڕامیاریی کورد دەڕوانن. واتە: هیچ جۆرە چارەسەرێکی دادپەروەرانە و ئازادیخوازانەیان پێ نەبووە و نییە. نموونەی دید و بۆچوونەکانیان، بەرانبەر کێشەی کورد لە کوردستانی مەزندا، لە بیروباوە، هەڵوێست و کردارەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێراندا، زۆر بە جوانی دەردەکەوێ.
هێندێ هێزی کۆنەپەرست، شۆڤێنیی و نەتەوەیی پەڕگیر و توندڕەویش هەن، لە هەموو هێزەکانی دیکەی نەتەوە باڵادەسەکانی چوار دەوڵەتەکە خراپترن. دەتوانین، بڵێین: بە گەورەترین دوژمنی گەلانی ناوچەکە دادەنرێن.
یەکێ لەو پیاوە دێمۆکراسیی و لیبراڵانەی ئەورۆ، سەرانی کورد بڕوایان پێ هێناوە، ڕێزی لێ دەگرن و بە سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانیی عێراق ـ INC دایان ناوە، دوکتۆر « ئەحمەد چەلەبی » یە، کە لە بۆچوون و تێڕوانینەکانیدا، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ شۆڤێنییەکانی دیکەی عەرەبدا نییە. چونکە، جگە لە گەلی عێراق و باکووری عێراق پتر، دان بە گەلێکی دیکەی جیاوازی سەربەخۆی وەک کورد و نیشتمانێکی جیاوازی وەک کوردستاندا نانێ. ئەمەش ناشارێتەوە و زۆر بە ئاشکرا دانیپێدادەنێ. بە تایبەتیی کاتێ، لە (1997/10/25)دا، لە شاری ستۆکهۆڵم، سیمینارێکی گرت، ناوچەکانی « کەرکووک و خانەقین و ژەنگار و ... تاد »، بە چەن ناوچە و شارێکی عێراق دانا و گوتی: هەر چەندە زۆربەی دانیشتووانیان، لە کورد پێکهاتوون، بەڵام ناتوانم، بڵێم کوردستانن!
لەبەرئەوە، (پێویستە لە سەر ڕۆشنبیران، نووسەران و سەرکردایەتی جوڵانەوەی ڕامیاریی کورد، پێوەندییەکی دۆستانە، شارستانییانە و نەتەوەیی یانەی مۆدرێن، لە نێوان ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد و جەماوەری نەتەوە باڵادەسەکانی « تورک و عەرەب و فارس »دا دامەزرێنن، بە شێوەیە کە بارودۆخێکی سایکۆلۆژیی و کەلتووریی پێشکەوتنخوازانە، لە نێوانیاندا بێنێتەکایەوە، تا لە ڕێی دەمەتەقێیەکی ئاشتییانە، هێمنانە و دیالۆگی ڕامیارییەوە، کاریان تێکەین و بڕوایان پێ بێنین، کە نە نەتەوەی کورد بەشێکە لە

نەتەوەکـانـی « تورک، عـەرەب و فـارس »، نـە خـاکی کـوردسـتـانیش، پارچەیەکە لە خاکی چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکە، وەک ئەوان دەیانەوێ، بەزۆر لـە خـۆشـیـان و لـە خـەڵکی دیکەشـی بگەیەنن! بەڵکوو زۆر پێویسـتـە، بێ هـیچ جۆرە سـڵـەمـینەوە و مـەراییکردنێ، لەو خـەون و ئەندێشانە دایانچڵەکێنین، لە ڕاستیی و دروستیی مەبەسەکانمان ئاگـاداریانکەینەوە، تا بزانن، نەتەوەی کـوردیش وەک ئەوان، نەتەوەیەکی سـەربەخـۆیە و لەوان جـیـاوازە، خـاوەنـی هـەمـوو جـۆرە خەسڵەت و مـەرجـە تایبەتییە نەتەوەیی یەکانی خـۆیەتی، هـیچیشی لەوان کەمتر نییە، تەنیا ئەوەندە نەبێ، ئیمپریالیزمی جیهانیی، خاکی کـوردسـتـانی داگـیـرکـردووە و وەک گـوێزەبانە بە سـەر ئەو نـەتەوە بالادەسـانەی چوار دەوڵەتەکـەدا دابەشـیکردووە. بۆیە، نەتەوەی کـورد بەو شـێـوەیە، پەرشـوبڵاو و خـاکی کوردسـتـانیش لەتوپەتکراوە، کورد ژێردەسەیە و خاوەنی دەوڵەتی یەکگرتووی ناسیۆنالی خۆی نییە.
لـەبەرئـەوەی کـوردیش، وەک ئـەوان نـەتـەوەیە، بـەپێـی هـەمـوو جـۆرە بیروباوەڕێکی زەمینیی و ئاسمانیش، هەموو مـافـە سـەرەکییەکانی ژیـانـی پـێ ڕەوادەبینرێ. پێـویسـتـە، لە کـەشـێکی ئازادانە و دیمـۆکراسـییانەدا، پاشـەڕۆژ و مـافی چارەنووسی خـۆی، بە دەسی خۆی دیاریکا، تا لە پاڵ نەتەوە دراوسێکانی« تورک، عەرەب و فارس » دا، لە ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا، پێکەوە بە ئازادیی، هـێمنیی و ئاشـتیی بژین و بەشـداریی لە پێشکەوتنی کـاروانی شـارسـتـانێتی گـەلانی ناوچەکـەدا بکا. ئەگـینا گـەر، تا ڕۆڵەکـانـی ئەو نەتەوانە و کاربەدەسانی ئەو چوار دەوڵەتە داگیرکەرە، گوێیان بەو ڕاسـتییانە ڕانەهێنرێ و بڕوایان پێ نەهێنرێ، نەک هـەر کـورد سـەربەست و کوردستـان ئازاد نابێ، بەڵکوو هـەر وەک ئێستـە، تەنیا بە ناوهێنانی پچووکترین مافەکانی گەلی کورد، لە هەر پارچەیەکی نیشتمانەکەیدا، سـەریان دەئاوسێ، ملیـان دەمـاسێ، کـەڕ، لاڵ، کـوێردەبن و بە دڕندانەترین شێوەش، پەلامارماندەدەن و قڕماندەکەن.)«90-91،4»
داگیرکەرانی کوردستان دەبێ، باش بزانن، (کێشەی کورد، لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا، پێش ئەوەی کێشەیەکی ئیداریی بێ، بە پلەی یەکـەم، کـێـشـەیەکی نەتەوەیی و ڕامـیـارییـە، دژی چەوسـاندنەوە،

دادۆشین و ستەمی نەتەوایەتی خەباتدەکا، لە پێناوی بەدەسهێنانی مافە نەتەوەییە ڕەواکانیدا، بە بەردەوامیی تێدەکۆشێ.)«91،4»
بۆیە، (نەتەوەی کورد دەبێ، لە هەموو پارچەکانی کوردستانی مەزندا، هەوڵی سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆی بدا. ئەمە وەک ستراتیژێکی بەرز دەبێ، پێڕەوکرێ. بەڵام، گەر توانا نەبوو، گەر بارودۆخی ناوچەکە و ڕەوشی نێونەتەوەیی، ڕێی ئەوەی نەدا، ئەو ئامانجە پیرۆزە بەدیبێنرێ، هەرگیز نابێ، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، تووشی ڕەشبینیی و ورەبەردان بن، هەرگیز نابێ، لە هیچ پارچەیەکی کوردستاندا، داواکاریی نەتەوەیی و ڕامیاریی سەرکردایەتی جوڵانەوەی کورد، لە مافی فیدراڵیی کەمتربێ.)«86،4»
ڕاستییەک هەیە، هەمیشە دەبێ، دووپاتیکەینەوە، ئەویش ئەوەیە: کورد خۆی، بۆ ئەوەی ئەو بارە نالەبارەی داگیرکردن، دابەشکردن، بندەسیی و چەوساندنەوەی نەتەوەیی بگۆڕێ، تا ئێستە بە کردەوە هیچی وای نەکردووە، دڵی پێ خۆشکرێ، بەکەڵکبێ و گۆڕانکارییەکی بنەڕەتیی، لە ڕەوشی ڕامیاریی کوردستاندا بەدیبێنێ، تا بە تەواویی باری سەرنجی گەلان و دەوڵەتەکانی جیهان، بە قازانجی خۆی بگۆڕێ و سەرنجیان بە لای خۆیدا ڕاکێشێ. بەڵکوو ئەوەی کردوویەتی، تەنیا لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەدا، داوای مافێکی پچووکی نەتەوەیی خۆی کردووە، کە ئەوەش بە شتێکی نێوخۆیی دادەنرێ.
دیارە چارەسەرەکەش، لە چەن خاڵێ بەدەر نییە:
1. کورد دەبێ، هەوڵێکی زۆری ڕامیاریی و دیپلۆماسیی، بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستانیی بدا. دیارە، وەک لە نێو کورددا باوە، لەو کاتەدا، هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکە یەکدەگرن و دژایەتی کورد دەکەن. بەڵام، جگە لەوەی لە مێژە، ئەو کارەیان بە ئەنجامگەیاندووە، ئەز لەو باوەڕەدام، لە گەلەکۆمەکیی و دەسدرێژێکانیاندا سەرناکەون و بۆیان سەرناگرێ. چونکە، لە لایەکەوە خەسڵەت و سروشتی جەنگەکەی نێوان کورد و دەوڵەتە داگیرکەرەکان دەگۆڕێ، بەشێ لە گەلەکانیان لەگەڵیان نابن و پشگیریی نەتەوەی کورد دەکەن. لە لایەکی دیکەشەوە، گەلانی جیهان، ڕێکخراوە خێرخوازیی و دیموکراسیی، پارتە ڕامیارییە پێشکەوتووخواز و

دەوڵەتە دادپەروەر و مرۆدۆستەکانیش، ئەو دژایەتیکردنە قەبوڵ ناکەن، کە پێش پەنجا ساڵ تورکەکان لە باکوور، فارسەکان لە ڕۆژهەڵات و عەرەبەکان لە باشوور کردوویانە. لەبەرئەوەی سەردەمەکە بە تەواویی گۆڕاوە و ئەو گەلە ئازادیخواز و دێموکراسیخوازنە، بە هەموو شێوەیە، یارمەتی شۆڕشە ئازادیخوازانەکەی نەتەوەی کورد دەدەن، کورد گەلێ قازانج لەو بارودۆخە نوێیەی نێودەوڵەتیی دەکا.
بەڵام، دیارە ڕزگاریی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانیی، قوربانی زۆری دەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا و لە هەموو بارێکدا، گەلێ لەوە چاکترە، ماوەی دووسەد ساڵێ دەبێ، هەر ڕاپەڕین و شۆڕشی نەتەوەیی بەرپادەکەین، کەچی بە هەرەس لە دوای هەرەس کۆتاییدێ و هیچ ئەنجامێکی باشی نەبووە و نییە.
2. گەر کورد خۆی، هەوڵ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ نەدا، ئەوا دەبێ، سیستێمی ڕامیاریی و ئابووریی، ئەو چوار دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانانە، لە سەر بنچینەکانی بیروباوەڕی سۆسیالیزمی زانستیی دامەزرێ. مافی هەموو کەمینە، گەل و نەتەوەکان، لە بەر ڕۆشنایی مافی چارەنووسدا، دیاریکرێ. فیدراڵیزمیش وەک سیستێمێکی ڕامیاریی و ئیداریی، بۆ هەر یەکێ لەو هەرێمانە دەسنیشانکرێ و بە باشترین شێوە پێڕەوکرێ. چونکە، ئەو نەتەوە سەردەسانە، بەو زووانە فێری دێموکراسیی نابن، سیستێمی فەرمانڕەوایی و بارودۆخی وولاتەکانیان، بە تەواویی پێ دێموکراتیزە ناکرێ، تا ئەوان فێری ئەو دێموکراسییەش دەبن، کە هەموو ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستان داوایدەکەن، کورد لەوە خراپتری بەسەردێ، کەسێکیش بە گەورەیی فێری پلاوخواردن بێ، دەس بۆ لووتی دەبا!
بە داخەوە، هێشتا سەرانی کورد، لە ڕووی هوشیاریی نەتەوەیی و ڕامیارییەوە، لەو ئاستە بەرزەدا نین، جێگەی هیوا و بڕوای نەتەوەکەمان بن، تا تەڵەی داگیرکەران، بە وریایی، زیرەکیی و دڵسۆزیی خۆیان بتەقێننەوە، هەموو شتێ لە پێناوی بەرژەوەندیی باڵای نەتەوەی کورد و خاکی نیشتماندا، بەختکەن. بەڵکوو چونکە، لەو بوارانەدا بە تەواویی پێ نەگەیشتوون، وەڵامی هەڵە بە هەڵە، هەڵە

بە ناپاکـیی، ناپاکـیی بە ناپاکـیی دەدەنەوە، لە پێناوی ئامـانجـە تایبەتییەکانی خۆیاندا، پێ لە هەموو شتێکی پیرۆز دەنێن، سڵ لە هیچ جۆرە تاوان و لێپرسینەوەیەکی مێژوویی ناکەنەوە.
لێـرەدا، زۆر جـێی خـۆیەتی، گـەر بە ئـاسـپـایی، بە گـوێی هێندێ کوردزمـانی سـەرلێشێواودا بچرپێنم و بڵێم: چیدیکە لەوە زیاتر، بە زورنا و دەهۆڵی داگیرکەران هەڵمەقونێنەوە، شـایی گـەرم مـەکەن و سـەرچۆپی مـەرگ مـەگرن. چیدیکە پڕوپاگەندە ژاراوییەکـانی، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان کاوێژمەکەنەوە. کورد لە هیچ پارچەیەکی نیشتمـانەکەی خۆیدا ئازاد نییە، سەربەستیی نییە. هیچ یەکێ لەو دەوڵەتە داگیـرکـەرانەی کوردسـتـان، دێمۆکـراسیی نین و هیـچ جۆرە مـافێ بە کـورد ڕەوا نابینن. هەمـوو کـوردێ، بە دوژمنی سـەرەکـیی خـۆیان دادەنێن. بۆیە هیچ کـوردێ نە دەتوانـێ، شـۆڤـێنیی و ڕەگەزپەرسبێ، نە دەشتوانێ، جگە لە نۆکەریی زیاتر، لە بەردەمی ئەو داگیرکەرانەدا، دەم هەڵبێنێتەوە و کارێکی باش بە ئەنجامبگەیەنێ. لە هەمـان کـاتیـشـدا، هیـچ ڕێکخـراوێکی ڕامـیـاریی کـوردسـتـانیش، تیرۆریست نییە، وەک دەوڵەتی داگیرکەری تورک، ئیسرایلی هاوپەیمان و ئەمێریکای ئاغایان، دەهۆڵی نابووتی بۆ دەکوتن!
لە کۆتاییـدا دەڵێم: با ئەو پرینسـیپـە کـلاسـیکـییـە لە بیـر خـۆمـان بەرینەوە، کـوردایەتیی تەنیـا بە زمـان، جلوبەرگ، کـاڵاوبـاڵا، سـەرومـێزەری کـوردیی نییـە. هەر کـەسێ بە کوردیی ئاخافتنیکرد، جلوبەرگێکی کوردیی لەبەرکرد، کڵاو و مێزەرێکی کوردیی لەسـەرنا، بێ ئەوەی کـردەوەیەکـی باشی لـێ چاوەڕوانکرێ، یا کـارێکی چاکی پێـشکـەش بە نەتەوەکـەی کـردبێ، نابێ، باوەڕی پێ بکرێ. گـەر بە مـێشک، هـۆش، گۆش، باوەڕ، دڵ و گیان کورد نەبێ، کـردەوەکانی لە ڕاژەی ئازادیی، سـەرفـرازیی، یەکـێـتی ڕیزەکـانی نەتـەوەی کـورد، سەربەخۆیی و ڕزگاریی خاکی کوردستاندا نەبێ، ئەوە کورد نییە.
ڕاسـتـە هەمـوو یەکێ، لە دایک و باوکێکی کورد لەدایکبووبێ و لە هەر شوێنێ گەورە بووبێ، بە کـورد دەژمێررێ، بەڵام، واتەی ئەوە نییـە، ئەو کـوردە دڵسـۆزی نەتەوە و خـاکی خـۆیەتیی و کـوردپەروەرە. چونکە، کوردایەتیی و کوردێتی، بـە ڕواڵەت و ڕووکـەش نییـە، بەڵکوو لە (بیری

چاک، گوتەی چاک و کردەوەی چاک)دا خۆی دەنوێنێ، بە خوێناوی ڕەگوڕیشەی دڵ و جگەر ئاودەدرێ. هەر بۆیە لای من، پیاوێکی مەردی قارەمانی وەک دوکتۆر « فوواد »، لە شۆڕشەکەی « شێخ سەعیدی پیران »دا، لە سەر کورد لە سێدارەدرا، لە کاتێکدا یەک ووشە کوردیی نەدەزانی، تورکەکانیش پێیانگوت: تۆ کورد نیت و کوردیی نازانی، چیت لە کوردایەتیی داوە، واز لەو بەزمە بێنە و بڵێ من تورکم، ئازادت دەکەین و لە سێدارەت نادەین. دوکتۆر فووادیش لە وەڵامدا دەفەرموێ: ڕاستە من کوردیی نازانم، بەڵام دڵم بۆ کورد لێدەدا. ئەوەبوو گیانی پاکی بە خاک و نەتەوەکەی بەخشی. ئەز پێموایە، ڕۆڵەیەکی مەردی تورکی وەک دوکتۆر (سمایل بێشکچی)، بۆ کێشەی کورد، لە هێندێ سەرکردەکانی ئەوڕۆی کورد، گەلێ دڵسۆزتر و بە ئەمەکترە.
گەر ئاشتییەکی گشتیی، لە نێوان دەوڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەندا ئەنجامدرێ، کورد لەو پرۆسێسە ئاشتییەی ڕۆژهەڵاتی ناوەندا تێنەخوێنرێتەوە، ئەوا لە پاشەڕۆژدا، کاسەکە تەنیا لە سەری کورددا دەشکێ. چونکە، لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا، هەر جوڵانەوەیەکی نەتەوەیی و ڕامیاریی سەردەرێنێ، هەر شۆڕشێکی چەکداریی بەرپابێ، دیارە باری ئارامیی و هێمنیی ناوچەکە دەشڵەقێنێ، کۆسپێکی گەورە لە بەردەم، بەرژەوەندیی دەوڵەتەکانی ناوچەکە و بەرەی خۆراوادا قووتدەکاتەوە. بۆیە، ئەوانیش جوڵانەوەکە بە جوڵانەوەیەکی تیرۆریستیی و سەرانی ڕێکخراو و شۆڕشەکەش، بە ئاژاوەچیی و گێرەشێوێن نێوزەددەکەن، بە هەمووشیان دژی ڕادەوەسن و سەرکوتیدەکەن. جا گەر ئەو کاتە، بەرژوەندیی دەوڵەتەکانی ناوچەکە یەکگرێ، ئەوا بە « نەوتی عەرەب، ئاوی تورکیا و تەکنۆلۆژیای ئیسرایل » قرماندەکەن. ڕاستە، گەر ئەو سێ فاکتەرە یەکگرن، ناوچەکە پێشدەکەوێ، بەڵام باری هیچ نەتەوەیە بە بارەی کورد نەبێ!
بۆیە، سەرانی کورد پێویستە، بە خۆیاندا بچنەوە، شێوازی بیرکردنەوەیان بگۆڕن، چاوێ بە دروشم و ستراتیژی ڕێکخراو و پارتەکانیاندا بگێڕنەوە، کوردانە بیرکەنەوە، تەنیاوتەنیا بۆ کورد و کوردستان هەوڵدەن، نەک بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان و ڕێکخراوەکانیان خەباتکەن، ئەگینا ئەوا نزیکەی پەنجا ساڵە

تێدەکۆشن، هیچ ئاکامێکی نەبووە، گەر سەد ساڵی دیکەش خۆیان ماندووکەن، تا بەو شێوەیەی ئەورۆ ڕەفتاربنوێنن، گومانی تێدا نییە، هەرگیزاوهەرگیز، هیچ بە هیچ ناکەن، ئەوە جگە لەوەی، ڕۆژبەڕۆژیش، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان پتر تێدادەچن و خاکی نیشتمانەکەشمان، پتر وێراندەبێ.

## سەرچاوەكان :


1. جلال الطالبانی، حول القضیه الكردیه فی العراق، ١٩٨٨
2. حوسێن محەمەد عەزیز، ململانێی ئایدۆلۆژی لە كوردستاندا، چاپی دووەم،چاپخانەی كیتاب هەرزان، سوید ـ یۆنشۆپینگ، ١٩٩٥
3. حوسێن محەمەد عەزیز، كورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، چاپی یەكەم، چاپخانەی كیتاب هەرزان، سوید ـ یۆنشۆپینگ، ١٩٩٦
4. حوسێن محەمەد عەزیز، فیدراڵیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چاپی یەكەم، چاپخانەی باران، سوید ـ ستۆكهۆڵم، ١٩٩٦
5. خ. ن، سەرنجێكی دیمۆگرافی پاشەڕۆژی كوردستان، ڕابوون، ژمارە(٥)، سوید، ١٩٩٣
6. عەبدوڵڵا غەفور، جوگرافیای كوردستان، چاپی یەكەم، چاپخانەی ئاپێك، سوید ـ ستۆكهۆڵم، ١٩٩٦
7. فەرید ئەسەسەرد، جیۆپۆلێتیكی كوردستان، سیاسەتی دەولی، ژمارە2 سالی دووەم، كوردستان ـ هەولێر، ١٩٩٣
8. د. محمد الحجازی، الجغرافیا السیاسیه، دار الاتحاد العربی للطباعه.
9. پرۆفیسۆر میخایل س. لازەریف، كورد و كێشەی كورد، گۆڤاری ئاسیا و ئەفریقای ئەورۆ، ژمارەی (١٢)، مۆسكۆ،١٩٨٣(بە زمانی ڕووسیی)
10. VARLDEN I FAKTA, KARTOR, FLAGGOR OCH KORTFAKTA OM VARLDENS LANDER, OVERSATTNING,MARGARETAELG,BONNIER CARLSEN, 1996,S - 240

# لە بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

گوتـــار :

1/ بەرەو ئازادی، ڕابوون، ژمارە 2، سوید، 1991، ل 46
2/ لە پێناوی ڕاستـیـدا، بەربانگ، ژمـارە 87، سـاڵی 12، سـوید، 1993،ل48
3/ یەکـێتی سۆڤـیـەتی هەڵوەشاوە لە ڕوانگەی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کـوردەوە، ڕابوون، ژمارە7 ـ 8، سوید، 1993، ل67
4/ دەربارەی کەسایەتیی کورد، ڕابوون، ژمارە 10ـ11، سوید،1994 ل71
5/ بەرەو ستراتیژێکی یەکگرتووی نەتەوەیی، هەنگاو، ژمارە 13 ، لەندەن،1995ل7
6/ سـایکۆلۆژییـەتی مـرۆڤی ئاوارەی کـورد و بازاڕی چاپەمـەنی کـوردی، گـزینگ، ژمارە8، سوید،1995، ل30
7/ لێکۆڵـینەوەیەک دەربارەی کـۆمـەڵگەی کـورددواری، گـزینگ، ژمـارە 9،1995، ل48
8/ کێرپە تاتانە ساواکەی دەنگ و ڕەنگی نەتەوەکەم( MedTV)، گزینگ، ژمارە 13، سوید، 1996.
9/ هەنگاوی یەکەم و سەرەتای کارێکی مەزن،بەربانگ، ژمـارە 102، سـاڵی 14، سوید، 1996،ل51
10/ چەند سەرنجێ دەربارەی سەرەخۆشی و پرسەدانان، بەربانگ، ژمارە 104، ساڵی 15، سوید، 1997،ل22
11/ دیکتاتۆرەکان لە بەر یەک ئاوێنە، قژی نەخشە و پلانەکانیان دادەهێنن،بەربانگ، ژمـارە 105، سـاڵی 15، سـوید، 1993،ل39. گـۆڤـاری دیمـۆکـراسی، ژمـارە30، ساڵی7، کوردستان ـ سلێمانی، تشرینی یەکەمی1997، ل16.
12/ کەی هۆشێ بە بەر خۆماندا دەهێنینەوە؟ بەربانگ، ژمارە 106-107، ساڵی 15، سوید، 1998 ،ل23. گۆڤاری دیمۆکراسی، ژمارە31، ساڵی7، کوردستـان ـ سلێمانی، نیسانی1998، ل21.
13/ با خـۆمـان چاک بناسین، بەربانگ، ژمـارە 108، سـاڵی 16، سـوید، 1998،ل27
14/ سێ سەرنجی زمانەوایی، مانگنامەی پەیام، ژمارە8، پووشپەڕ1998، ل18
15/ مـافی دیاریکردنی چارەنووس، گـۆڤـاری ئاڵا، ئۆرگـانی پارتی سـەربەخـۆیی کوردستان، ژمارە30، ڕێبەندانی1998، ل7.
16/ بۆرە نەبێ، بازەبێ، کلکی بە ئەندازەبێ،بەربانگ، ژمارە 109، 1988، ل27

17/ چەند سەرنجێ دەربارەی ناسنامەی ئایینیی و نەتەوەیی خەلیل منەوەر، گۆڤاری ئێستا، ژمارە 20، کوردستان ـ سولەیمانیی، نیسانی1999، ل 3-9.
18/ زێوەر لە نێوان کوردایەتیی و عێراقچێتیدا، گۆڤاری ئایندە، ژمارە 1، کوردستان ـ سولەیمانیی، تەمووز 1999، ل 54 - 61 .
19/ داری بەزدیی خوا، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، بەشی یەکەم، ژمارە 1902، ڕۆژی سێشەممە 1999/7/13. بەشی دووەم، ژمارە 1903، چوارشەممە 1999/7/14 کوردستان، سولەیمانیی.
20/ دەربارەی مەلەفی کەرکووک، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە 1923 ڕۆژی چوارشەممە 1999/8/11 کوردستان ـ سولەیمانی. مانگنامەی کوردستانی نوێ لە دەرەوەی وولات، ژمارە 67، ڕۆژی چوارشەممە 1999/8/25 .
21/ شێوازی خەبات و مافی چارەنووسی نەتەوەکان، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە 1928، ڕۆژی چوارشەممە 1999/8/18، کوردستان ـ سولەیمانیی.
22/ دەربارەی فریزیۆلۆژی کوردیی، ڕۆژنامەی ئالای ئازادی، ژمارە 320، ڕۆژی دووشەممە 1999/7/12، کوردستان ـ سولەیمانیی.
نامیلکە و پەرتووک :
1/ دەربارەی پرۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەڵبەندی ڕۆشنبیری کوردی، سوید، 1994، ل32
2/ دوا پرۆژە، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەڵبەندی ڕۆشنبیری کوردی، سوید،1994، ل11
3/ پێنج ووتاری غەمگین، چاپخانەی باران، سوید،1994، ل77
4/ دیموکراسی، ئایدۆلۆژی و جەنگی نێوخۆ، چاپخانەی باران، سوید، 1994، ل84
5/ ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا، چاپی یەکەم، سولەیمانی،1993، ل208. چاپی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی کتێبی هەرزان، سوید،1995، ل125
6/ پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا، چاپی یەکەم، چاپخانەی باران، سوید، 1996، ل91. چاپی دووەم، کوردستان ـ سولەیمانیی، 1996.
7/ نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، چاپخانەی باران، سوید، 1995، ل47
8/ کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی کیتاب هەرزان، سوید ـ یۆنشۆپینگ، 1996، ل222.
9/ فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چاپی یەکەم، چاپخانەی باران، سوید، 1996،ل98. چاپی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی دیموکراسی، کوردستان ـ سولەیمانی،

1996، ل90
10/ بەڵێ لێکۆڵینەوە و ڕەخنە نەک شێواندنی ڕاستیی، چاپی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی کیتاب هەرزان، سوید، 1996´، ل53
11/ خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا، دەقی چاوپێکەوتن و دەمەتەقێیەک لەگەڵ جەرجیس فەتحوڵڵای پارێزەردا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاپێک، ستۆکهۆلم، 1997، ل126 .
12/ ڕۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، چاپی یەکەم، چاپخانەی میدیا، سوید ـ ستۆکهۆلم، 1997، ل100
13/ گیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد، لە بلاوکراوەکانی کیتاب هەرزان، سوید ـ یۆنشۆپینگ، 1998، ل80.
14/ ئۆجەلان ئەزموونێکی نوێ و پەندی مێژوویی، چاپی یەکەم، چاپخانەی میدیا، سوید ـ ستۆکهۆلم، 1999، ل104. چاپی دووەم، کوردستان ـ سولەیمانیی، 1999 .
15/ سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، لێکۆڵینەوە و ڕەخنە، چاپی یەکەم، چاپخانەی هەواڵ، سولەیمانیی، 1999.

گەر ئاشتییەکی گشتیی، لە ... ناوەندا ئەنجامدرێ، کورد لەو پرۆسێسە ئاشتییەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تێنەخوێندرێتەوە، ئەوا لە پاشەڕۆژدا، کاسەکە تەنیا لە سەری کورددا دەشکێ. چونکە، لە هەر پارچەیەکی کوردستاندا، هەر جوڵانەوەیەکی نەتەوەیی و ڕامیاریی سەردەربێنێ، هەر شۆڕشێکی چەکداریی بەرپابێ، دیارە باری هێمنیی ناوچەکە دەشڵەقێنێ، کۆسپێکی گەورە لە بەردەم، بەرژەوەندیی دەوڵەتەکانی ناوچەکە و بەرەی خۆراوادا قووتدەکاتەوە. بۆیە ئەوانیش، جوڵانەوەکە بە جوڵانەوەیەکی تیرۆریستیی و سەرانی ڕێکخراو و شۆڕشەکەش، بە ئاژاوەچیی و گێرەشێوێن نێوەزەددەکەن، بە هەمووشیان دژی ڕادەوەستن و سەرکوتیدەکەن.

---

# *THE MAIN KURDISH PROBLEMS*

## *BY*

## *Dr. HUSSEIN M. A.*

2000 (2700 K)